www.alibapir.com

مەوسووعەی

بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان

وەحیی و واقیع دا

کتێبی چوارەم

# پایەکانی

# بیرکردنەوەی ئیسلامیی

عەلی باپیر

**مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا**

**نووسینی: عــەلی بـــاپیر**



چاپی یەکەم ١٤٤٠ز - ٢٠١٩ك

**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

عەلی بــاپیر (نووسەر)

مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا

٣١٤ لاپــەڕە

١٧* ٢٤ سـم

بابــەت : ئـایینی

ISBN: 978-9933-593-83-4

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٣١١ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە

"بیروبۆچونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ** : نـــەوزاد کۆیـــی

**دیزاینی ناوەوە و بەرگ** : زەردەشت کاوانی

مەوسووعەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان

وەحیی و واقیع دا

- کتێبی چوارەم -

- تەوەری چوارەم -

# پایەکانی

# بیرکردنەوەی ئیسلامیی

نووسینی

عەلی باپیر

## پێشکەش بێ

به هەرکەسێك، كه به شێوەیەكی شایستە عەقڵی خۆی له بواری بیركردنەوەدا بەكاردێنێ و، به زەینێكی هۆشیارو دڵێكی بێدارەوە:

له هەردووك كتێبی خوێندراوو بینراو (مَقروء و منظور)ی خوای پەروەردگارەوە ڕادەمێنێ و، سەرەنجام زانیاریی و شارەزاییەكی بەئامانج گەیەنەریان لێ وەدەست دێنێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ ..... ﴿٤٦﴾﴾ سبأ.

# پێشەكیی

## پێناسەو بەسەرهاتی پەیدابوونی ئەم مەوسووعەیە

إِنَّ الْحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إِلَهَ إِلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب

أَمَا بَعد:

فَإِنّ أَصْدقَ الحديث كَلامُ الله، وَخَيرَ الهَدْيِ هَديُ مُحَمَّد صَلّى اللّه عَليهِ وَسلَم، وَشَرّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلّ مُحدثَةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلّ ضَلالةٍ فِي النّار.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ئەم مەوسووعەیەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا) کۆی ئەو چل و نۆ (٤٩) دەرسەیە کەبەندە لەنێوان ڕۆژانی: (٢٠١٦/١٠/٢١) تاکو (٢٠١٧/٥/٥)دا، پێشکەشی کۆمەڵێکی بژاردە لە براو خوشکانم کردوون، لەخولێکدا کە (ناوەندی ڕاهێنان و گەشەپێدان) کردبوویەوەو، سەرجەم دەرسەکانیش لە کەناڵی تایبەتی بەندە لە یوتیوب:

www.youtube.com/playlist?list=PL6HuvNeXiFwuuTQtJAAu-) WqXQoCnKQqX2X) دانراون[1].

شایانی باسیشە کە کۆی ئەو چل و نۆ دەرسە، لەلایەن برای دڵسۆزم کاك (قاسم سەلام)ەوە هێنراونە سەرکاغەزو تایپ کراون و، پاش چاو پێداگێڕانەوەی وردی خۆم، دووبارە هەڵەچن کراونەتەوە، تاکو بەم ئاکامە گەیشتوون کە دەیبینی، بۆیە بەپێویستی دەزانم لەناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینمی عەرز بکەم و، لەخوای بەخشەریش داواکارم بەباشترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

هەڵبەتە لەمێژیشە گەیشتوومەتە ئەوقەناعەت و بڕوایە، کە کێشەی گەورەی مسوڵمانان و هۆکاری بنەڕەتیی دواکەوتوویی و پەرێشانییان لەم ڕۆژگارەدا، بریتیە لە کەمتەرخەمیی و کرچ و کاڵیی و پاشان بەجێماوییان لەبواری هزرو بیرکردنەوەداو، سەرەنجام بەهەڵە تێگەیشتن، بگرە زۆر جار سەرەوبن تێگەیشتنیان، لەزۆر بابەت و مەسەلەی دین و ژین!

بۆیەش بەپێویستم زانی لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل لەوبارەوە بکەم، کە سەرەنجام ئەو بابەتەی لێ هاتەدی، کە هیوام وایە کەلێنێکی باش لەوبوارەدا بگرێ و، هۆکاری بەرچاو ڕوونبوونەوەیەکی باشی مسوڵمانان بێ لەوبارەوە.

---

(١) ناوونیشانی ئەوبابەتەی داوام لێکرابوو ئامادەی بکەم، بریتی بوو لە: (هزری ئیسلامیی) بەڵام بەو شێوەیەم گۆڕی، کە کراوەتە ناوونیشانی ئەم مەوسووعەیە، دواتریش حیکمەت و هۆکارەکەی دەخەینە ڕوو...

ئنجا بەمەبەستی ئاسانتر بەهرە لێوەرگیرانی ئەم مەوسووعەیە، هەرچەندە هەرپێنج تەوەرەکەی پێکەوە پەیوەستن، بەڵام بەباشم زانی هەمووی بەپێنج کتێب چاپ و بڵاوبکەینەوە، هەرتەوەرەی لەکتێبێکی سەربەخۆدا.

لەخوای بە بەزەیی و بەخشندەش داواکارم پیت و پیزێکی شایستە بخاتە ئەم مەوسووعەیەوە، بەهەر پێنج کتێب و تەوەرەکەیەوەو، ئەوئامانجەی بۆی لەبەرچاو گیراوە، بەباشترین بیهێنێتەدی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

١٠/ی ڕەجەب/١٤٣٩ك

٢٠١٨/٣/٢٧ز

هەولێر



# ڕێخۆشکردن و نەخشەی گشتیی

پرۆسەی کارلێك (تفاعل)ی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگارو واقیعێکدا، کە تێیدا دەژین، ئەو کارلێکە، هەمیشە هۆکاری گەشە کردن و بەرەو پێش چوونیان و بەزیندوویێتیی مانەوەی کۆمەڵگاکانیان بووە، بە پێچەوانەشەوە: دابڕانی عەقڵ و هۆشی مسوڵمانان، لە تێوەڕامانی وەحیی و چاك تێگەیشتنی واقیع، هەمیشە هۆی مردوویێتیی و وەستان و بەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەبینین.

ئەم بارودۆخەی ئێستا مسوڵمانانی تێدان، بەرهەمی ئەوەیە کە مسوڵمانان - بە شێوەیەکی گشتی- باش نەیانتوانیوە عەقڵ و هۆشی خۆیان بخەنە کار، لە تێوەڕامانی وەحیی و لە سەرنجدانی واقیعدا، بۆیە من وەك هەوڵ و هەنگاوێك لەم بوارەدا، بە پێویستم زانی ئەم بابەتە لە (٤٩) ئاڵقەدا پێشکەش بکەم، لەژێر ناوونیشانی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا}و، سەرجەم ئەم بابەتەش دەکەین بە پێنج تەوەرە:

**تەوەری یەکەم: ڕوونکردنەوەی چەمك و چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە چوار بەشی سەرەکیی پێك دێ:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی و چەند وشەیەکی دیکەی نیزیکی.

**بەشی دووەم:** سەرنج دانێکی مێژوویی لە بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا.

**بەشی سێیەم:** سەرچاوەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.

**بەشی چوارەم:** گرنگیی و پێویستیی بیرکردنەوە (تفکّر) لە ئیسلامدا.

**تەوەری دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان.**

ئەم تەوەرەش لە سێ بەشی سەرەکیی و (٥١) کورتە باس پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** تایبەتمەندییە گشتییەکان، (٢٠) تایبەتمەندیی.

**بەشی دووەم:** تایبەتمەندییە عەقیدەیی و فیکرییەکان، (١٧) تایبەتمەندیی.

**بەشی سێیەم:** تایبەتمەندییە ڕەوشتییەکان، (١٤) تایبەتمەندیی.

**تەوەری سێیەم: تەوژمە فیکرییە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان.**

که سەرجەم بیست (٢٠) تەوژمی جۆراو جۆرمان لێ هەڵبژاردوون و، لەبیست بەشدا خستوومانە ڕوو:

١- خەواریج.

٢- مورجیئە.

٣- جەبرییە.

٤- قەدەرییە.

٥- جەهمییە.

٦- موعتەزیلە.

٧- شیعە.

٨- ڕافیزە.

٩- ناصیبە.

١٠- ئەهلی حەدیس.

١١- ئەشعەرییەکان.

١٢- ماتوریدییەکان.

١٣- باطینییەکان.

چواردە (١٤) گرووپیشمان لە باطینییەکان باسکردووە.

١٤- فەلسەفەو فەیلەسووفەکان.

١٥- تەصەووف و صۆفییەکان.

١٦- مەزهەبە فیقهییەکان.

١٧- وەهابییە.

١٨- سەنووسییە.

١٩- مەهدییە.

٢٠- جامیعەی ئیسلامییە.

**تەوەری چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی.**

ئەم تەوەرەش لە پێنج بەشی بنەڕەتیی پێکهاتوە:

**بەشی یەکەم:** بوونناسیی (علم الوجود- ontologu).

**بەشی دووەم:** ئیمان و عەقیدە.

**بەشی سێیەم:** تێڕوانینەکان (التصورات).

**بەشی چوارەم:** بەهایەکان (القیم).

**بەشی پێنجەم:** پێوەرەکان (الموازین).

**تەوەری پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراو جۆر.**

ئەم تەوەرەش لە دە (١٠) بابەت پێکهاتوە، کە هەرکامیان لەبەشێکی سەربەخۆدا دەخەینەڕوو:

**بەشی یەکەم:** پەیوەندیی نێوان وەحیی و عەقڵ، تەواوکارییە.

**بەشی دووەم:** شەریعەتی چەسپاوو ژیان و گوزەرانی گۆڕاو!

**بەشی سێیەم:** ڕەوایی: فرەیی فیکریی و سیاسیی و ئایینی (مشروعية التعددية الفكرية والسياسية والدينية).

**بەشی چوارەم:** هاوولاتێتیی نامسوڵمانان لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامییدا: ماف و ئازادییەکانیان.

**بەشی پێنجەم:** مافی چارەنووس و ئیدارەی خۆ بەدەستەوەبوونی نەتەوەکان.

**بەشی شەشەم:** ڕاوێژ (شورى)ی ئیسلام و دیموکڕاسی، خاڵی هاوبەش و جیاوازیان.

**بەشی حەوتەم:** ئافرەت و خێزان و گۆڕانکارییەکانی دنیا.

**بەشی هەشتەم:** تەوژم و لایەنە ئیسلامییە هاوچەرخەکان.

**بەشی نۆیەم:** بنەما گرنگەکانی: تەبایی و یەکڕیزیی و هاوکاریی تەوژم و لایەنە ئیسلامییەکان.

**بەشی دەیەم:** بنچینە سەرەکییەکانی دینداریيەکی ساغ و مسوڵمانەتییەکی ڕاست و دروست.

## پێشەکی تەوەری چوارەم

**خوێنەری سەنگین!**

ئەم تەوەری چوارەمە {پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی} لە پێنج بەش پێکهاتووە، هەر کام لەو پێنج بەشە بۆ توێژینەوە لە بارەی یەکێك لە پێنج پایە بنەڕەتییەکانی {بیرکردنەوەی ئیسلامیی} تەرخان کراون، بەم شێوەیە:

بەشی یەکەم: بوونناسیی (علم الوجود - المعرفة Ontology).

بەشی دووەم: ئیمان و عەقیدە.

بەشی سێیەم: تێڕوانینەکان (التصوّرات).

بەشی چوارەم: بەهایەکان (القيم).

بەشی پێنجەم: پێوەرەکان (المقاييس).

پێم وایە ئەم پێنج پایەی کە لەم تەوەری چوارەمەدا دەیانتوێژینەوە، پایەو کۆڵەگە بنەڕەتییەکانی بیر کردنەوەی ئیسلامیی پێکدێنن و، لە ڕیزبەندیی (ترتیب)یشیاندا، پلە پلەیی (تدرُّج) ڕەچاو کراوە، چونکە:

بەر لەهەر شتێك بیرکردنەوەی ئیسلامیی پێویستیی بە بوونناسیی (علم الوجود) هەیە، واتە: چۆنیەتی تێگەیشتنی مرۆڤ لە بوون (وجود) بەبەدیهێنەرو بەدیهێنراو (خالِق و خَلْق)ەوە.

پاشان بوونناسیی ڕاست و دروست، دەبێتە بناغەو چاوگی ئیمان و عەقیدە، مادام مرۆڤ بە شێوەیەکی لۆژیکیی (منطقي) مامەڵە لەگەڵ دەرەنجامەکەیدا بکات.

ئنجا دوایی ئیمان و عەقیدەش دەبێتە بناغەو سەرچاوەی تێڕوانینە ڕاست و دروستەکان (التصورات الصحيحة) بۆ:

دنیا، دوارۆژ، ژیان، مردن، زانیاریی، ڕەوشت، سیاسەت، ...هتد.

پاشان بەهایەکان (القيم) سەرهەڵدەدەن، لە هەموو بوارو ڕەهەندەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵدا.

دواییش پێوەرەکان (المقاييس) بۆ شتەکان و کەسەکان پەیدا دەبن و، لەڕاستییدا ئەم پێنج پایە بنەڕەتییە وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك یەکدی پەلکێش دەکەن و بەدوای یەکدا دێن.

ماوەتەوە ئاماژە بەوە بکەم کە:

ئێمە لە: {مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)} کتێبی یەکەمیمان تەرخان کردوە بۆ قسە کردن، لەبارەی بابەتی گەورەو گرنگی: بووناسیی (علم الوجود- Ontology) بە ناوونیشانی: {الإسلام: مَعرِفة صَحيحة بِالخالِقِ وَالخَلق}.

ئنجا هەرچی لەم تەوەرەدا لەبەشی یەکەمدا وەك پایەی یەکەم، لە بارەی {بووناسیی}یەوە دەخرێتە ڕوو، سەرچاوەکەی کتێبی ناوبراوە.

هەروەها هەر کام لە {ئیمان و عەقیدە} و {تێڕوانینەکان (التصورات)} و {بەهایەکان (القيم)} و {پێوەرەکان (المقاييس)}یش کە پایەکانی دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم، پێك دێنن، دیسان لە کتێبەکانی دیکەی ئەو مەوسووعەیە وەرگیراون، (ئیمان و عەقیدە) لە کتێبی دووەم: {تعريف الإيمان}.

هەر کام لە: تێڕوانینەکان و بەهایەکان و پێوەرەکانیش، لە کتێبی دەیەم: {إلتزام المجتمع بالشريعه}.

پێشم وایە کاتێك مرۆڤی مسوڵمان ئەم پێنج پایە گەورەو بنەڕەتییە، لە عەقڵ و دڵیدا دەچەسپێن و باش هەزمیان دەکات، لە بواری ڕاست تێگەیشتن و دروست

بیرکردنەوەدا، دەکەوێتە سەر ڕاستە شەقامێك کە هیچ ڕەشەباو گەردەلوولێك زەفەری پێ نابات و نایلەخشێنێ، چ جای بیجوولێنێ یان بیلەقێنێ!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

٢١ رجب ١٤٣٩ك

٢٠١٨/٤/٧ز

هەولێر

# بەشی یەکەم

## پایەی یەکەم

## بوونناسیی

## (علم الوجود، المعرفة: Ontology)

١- خوا ناسیی.

٢- گەردوونناسیی.

٣- مرۆڤناسیی.

٤- دنیاو دوارۆژناسیی.

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشی یەکەمە وێڕای (بەرایی)، لە چوار باس (مبحث) پێك دێ:

**باسی یەکەم:** خواناسیی.

ئەم باسە لە یازدە (١١) بڕگەدا دەخەینەڕوو، کە هەموویان لە چوارچێوەی باس و خواس لەبارەی خوای بەرزو مەزن و بێ وێنەوە دان.

**باسی دووەم:** گەردووناسیی.

ئەم باسەش لە هەشت بڕگەدا دەخەینە ڕوو.

**باسی سێیەم:** مرۆڤناسیی.

ئەمیش لە شەش بڕگەی چڕو پڕو گوشراودا دەخەینە ڕوو.

**باسی چوارەم:** دنیاو دوارۆژناسیی.

ئەم باسی چواردم و کۆتاییەش لە حەوت بڕگاندا کورت و پوخت دەکەینەوە.

واتە: سەرجەم:

١١ + ٨ + ٦ + ٧ = ٣٢ بڕگە، بۆ خستنە ڕووی بوونناسیی ئیسلامیی تەرخانکراون.

# بــەرایی

**خوێنەری سەنگین!**

لەم (بەرایی)یەدا تیشکێك دەخەینە سەر چەمك و واتای وشەی (بووناسیی- علم الوجود)و دەڵێین:

بێگومان هەموو مرۆڤێكی خاوەن عەقڵ و هۆش، هەمیشە كۆمەڵێك پرسیاری لەلا دەورووژێنرێن، كە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ نادیدەیان بگرێ و، خۆییان لێ دەرباز بكات، وەك:

من چیم و كێم و، لە كوێوە هاتووم و، كێ هێناومیە دی و، بۆچی و، پێویستە چۆن بژیم و، چی بكەم و چی نەكەم و ....هتد؟!

ئنجا: ئایا ئەم گەردوونە، بە سەروخوار (ئاسمان و زەویی) یەوە، چییەو، چۆن هاتۆتە دی و، كێ هێناویەتە دی و، بۆچی و، سەرەنجامی چۆن دەبێ و ....هتد؟!

ئنجا: ئایا ئەم ژیانە دنیاییە، حیكمەت و ئامانجەكەی چییەو، پێویستە چۆن بگوزەرێنرێ و، چ ئەركێكی تێدا ئەنجام بدرێ و بەپێی چ بەرنامەیەك بەڕێ بكرێ و، ئایا ئەم ژیانی دنیایە هیچ قۆناغێكی دیكەی بەدوادادێ، چۆن دەست پێ دەكات و، چۆن كۆتایی دێ و، چی تێدا دەگوزەرێ و، ئاكام و كۆتاییەكەی چۆن دەبێ و ....هتد؟

ئنجا شایانی باسە {بووناسیی} دەیەوێ وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانە بداتەوەو، ئێمەی مسوڵمانیش دڵنیایی تەواومان هەیە كە جگە لە (وەحیی) خوا،

هیچ ئایین و بەرنامەیەکی دیکە لە بارانیدا نیە، بوونناسییەکی وا بخاتە دەست مرۆڤ، کە وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوەو، مرۆڤ لەبارەی خۆی و خواو گەردوون و ژیانەوە، بەرچاو ڕوون بکات و، ئاشکراشە تاکە نوسخەی (وەحیی) جێی متمانەو باوەڕ، ئەوەیە کە لە دوو توێی قورئاندا بەرجەستەیەو، سوننەتیش لەسەر ئەرزی واقیع چەسپاندوویەتی، هەڵبەتە ئیسلامی بەرجەستە لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم (محمد)یشدا (صلى الله عليه وسلم)، کۆتا نوسخەی هیدایەتی خوایەبۆ مرۆڤ و، بەڕاستدانەری تێکڕای نوسخەکانی دیکەی هیدایەتی خواشە کە: لەپێش ویدا بۆ مرۆڤ و جند نێرراون، هەر لە سەرەتای نیشتەجێ بوونیانەوە لەسەر زەوی، وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾ طه.

واتە: (خوا) فەرمووی: هەردووکتان (ئادەم و ئیبلیس) لێی دابەزنە خوار {لە ئاسمان یان لە بەهەشت کە لە ئاسمانە، یان لە باغێکی سەر زەوی کە لە شوێنێکی بڵند بووە} هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن، ئنجا هەر کات لە منەوە بەرنامەو ڕێنماییتان بۆ هات، بێگومان هەرکەس شوێن بەرنامەو هیدایەتی من بکەوێ، نە گومڕا دەبێ و نە ژینتاڵ و بێ مراد.

بەڵێ بەڕێزان!

بێجگە لە خوای بەرزو مەزنی پەنهانزان و شارەزای وردو درشت و ئاشکراو پەنهان و سەرو خواری بوون (وجود)، هیچ کەسی دیکە زانیاری تەواوی بە: گەردوون و مرۆڤ و ژیان و دنیاو دوارۆژ، نیە، تاکو بتوانێ بوونناسییەکی ڕاست و دروست بخاتە بەردەست مرۆڤ و، تەنیا دوایین نوسخەی هیدایەت و وەحیی و پەیامی خوا: (قورئانی مەزن) ئەوەی لە توانادا هەیە، چونکە خوا زاناو توانا عز وجل هەرچی مرۆڤ و جند بۆ ئەم ژیانە دنیایەیان پێویستیان بووە، بۆی خستوونە دوو توێی قورئانی بەپێزەوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ قُلْ أَنزَلَهُ ٱلَّذِى يَعْلَمُ ٱلسِّرَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٦﴾ ﴾ الفرقان.

واتە: بڵێ: (ئەم قورئانە) کەسێك دایبەزاندوە کە نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێ، بە دڵنیایی ئەو لێبوردەی بەبەزەییە.

ئێستاش بەچاکی دەزانم حیکمەتی بەکار هێنانی وشەی (بوونناسیی) ڕوون بکەمەوە، کە لە جیاتی (جیهانبینیی) و (دنیا بینیی) بەکارمان هێناوە:

## بوونناسیی[١]، نەك جیهانبینیی و دنیابینیی:

سەرەتا دەڵێین:

ئێمە وشەی {دنیا بینیی}، یان {جیهانبینیی}یمان پێ ڕاست نیە، کە لە بەرامبەر (علم الوجود - Ontology)دا بەکاربێ، چونکە:

هەرکام لە (جیهان) و (دنیا) مەبەست پێیان ئەو بوونەوەرە بەرهەست (محسوس)ەیە کە دەبینرێ و، لەو سنوورە بەو لاوە دەلالەت لەسەر هیچی دیکە ناکەن، بەڵام {بوونناسیی} یانی: ناسینی (بوون- وجود) ئەمیش هەم خوا سبحانە و تعالى، کە خاوەنی بوونی خودیی (ذاتي)و سەربەخۆ (مستقل) و بەدیهێنەری بەدیهێنراوەکانەو، هەم بەدیهێنراوەکانیش، هەموویان پێیان دەگوترێ: بوون (وجود)، واتە: هەرچی کە هەیە، ئنجا چ بوونەکەی سەربەخۆ بێ و لەخۆیەوە بێ، کە خوایە سبحانە و تعالى، واتە: بوونەکەی نەبوون (عدم)ی پێش نەکەوتبێ، کە تەنیا خوایە، چ دروستکراوبێ و بوونەکەی سەربەخۆ نەبێ و لەخۆیەوە نەبێ و، نەمانیشی بەسەردابێ، کەواتە: {بوونناسیی} واتە: زانیاریی دەربارەی بوون (الوجود) ئنجا ئەو بوونە، چ بەدیهێنەر (خالق) و خاوەنی (بوون) بێ، کە خوایە، چ بەدیهێنراو (مخلوق)، ئەویش چ بەرهەست (محسوس) بێ، چ نابەرهەست (غیب) بێ، بەڵام وشەی (جیهان) یان (دنیا) تەنیا شتە بەرهەستەکانی دروستکراوەکان دەگرێتەوە، یانی: ئەوانیش هەمووان ناگرێتەوە.

---

(١) شایانی باسە کە خۆم وشەی {بوونناسیی}یم بۆ واتای وشەی: (علم الوجود - المعرفة)ی عەرەبیی و {Ontology} ئینگلیزیی، داتاشی، لە جیاتی: {جیهانبینیی} یان {دنیابینیی}، لەبەر ئەو هۆکارەی کە لەسەرێ خستوومەتە ڕوو.

شایانی باسە: وەك پێشتریش گوتمان: کتێبی یەکەمم لە مەوسووعەی: (الإسلام کما یتجلی في کتاب الله) هەمووی تەرخان کردوە بۆ {بووناسیی} کە پێشتر بەم شێوەیە نەمبینیوە کتێبێکی سەربەخۆ بۆ ئەو بابەتە تەرخان بکرێ، کە پێم وایە ئەوە کەم و کوورییەك بووە، لە باسکردنی {ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی}دا، کە یەکسەر لە ئیمان بەخواوە دەست پێ بکەی، چونکە پایەکانی ئیمان ئەگەر پێنجن، وەك لە قورئاندا هاتوون و دوایی باسیان دەکەین، ئەگەر شەشن، وەك لە سوننەتدا پایەی شەشەمیشیان خراوەتە گەڵ، کە بریتیە لە ئیمان بە قەدەر، بەڵێ پایەکانی ئیمان، بناغەکەیان بریتیە لە {بووناسیی} یانی: پایەکانی ئیمان لەسەر ئەم بووناسییە بنیات دەنرێن و دادەمەزرێن، چونکە هەر لەخۆوە ئیمان و عەقیدە پەیدا نابێ، بەڵکو بناغەیەکی هەیە، چونکە ئەگەر وەك حاڵەتی مەنتیقیی و لۆژیکیی تەماشا بکەین:

ئینسان بۆچی ئیمان بەخوا دێنێ؟ دیارە پێشتر دەبێ خوای ناسیبێ، چ شتێك پاڵمان پێوە دەنێ ئیمان بەخوا بێنین؟ بێگومان ئەم گەردوونە ناچارمان دەکات ئیمانی پێ بێنین، کەواتە: زانین پێش ئیمان دەکەوێ، {بووناسیی} پێش ئیمان و عەقیدە دەکەوێ و، لەسەر بناغەی ئەو بووناسییە، ئەو ئیمان و عەقیدەیە پەیدا دەبێ.

هەر بۆیەش ئەوەی کە لە زۆربەی ئەو کتێب و بەرهەمانەدا دەیبینن، کە لە بارەی ئیمان و عەقیدەوە نووسراون، کە یەکسەر لە خستنە ڕووی پێناسەی ئیمان و پایەکانەوە دەست پێدەکەن، قورئان وای نەکردوە، تەماشا بکەن سێزدە (١٣) ساڵ قورئان لە مەککە دابەزیوە، کوا لەکوێدا پایەکانی ئیمان باس کراون، بەو شێوەیە کە ئێمە دەیخوێنین؟!

لە ڕاستییدا لە قورئانی مەککەییدا، وەك چۆن لە سەرەتاوە حوکمە شەرعییەکان نەهاتوونە خوارێ، چونکە حوکمە شەرعییەکان دەبێ بۆ کۆمەڵگایەك بێنە خوار، کە لەسەر پێی خۆی وەستابێ و، خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ، تاکو بتوانێ حوکمەکان جێبەجێ بکات، ئەگەرنا وەك پەندێکی عەرەبی دەڵێ:

(إذا أردت أن تطاع، فَأْمُرْ بما يُستطاع) ئەگەر ویستت فەرمانبەرییت بکرێ، فەرمان بە شتێك بکە کە بگونجێ و لەتوانا دابێ، خوای کاربەجێ لە مەککە حوکمە شەرعییەکانی دانەبەزاندوون، لەبەر ئەوەی لەوێ جارێ کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی بوونی نەبووە، کە خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆی بێ و لەسەر پێی خۆی وەستابێ، قەوارەی سیاسیی هەبێ و بتوانێ حوکمە شەرعییەکان جێبەجێ بکات، ئنجا بەهەمان شێوەش لە قورئانی مەککەییدا زیاتر جەخت کراوەتەوە لەسەر بووناسیی (معرفة)، بەڵێ: باسی ئیمانیشی تێدایە، بەڵام بەدڵنیایی دوایی لە سوورەتی (البقرة)دا پایەکانی ئیمان باس کراون، هەروەها لە سوورەتی (النساء)دا، کە دوایی باسیان دەکەم، هەروەها دوایی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتەکانیدا باسی پایەکانی ئیمان و ئیسلام دەکات، چونکە پێشتر دەبێ خەڵك خوا بناسێ، ئنجا ئیمان بەخوا بێنێ، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە، لەبەر ئەوەی خوایان باش نەدەناسی (دەیانناسی، بەڵام باشیان نەدەناسی) هاوبەشیان بۆ دادەنا.

بۆیەش من پێم وایە ئێستاش بۆ مسوڵمانان زۆر گرنگە، تاکو لە شیرك دووربن و، لە هەموو ئەو شتانەی کە لەگەڵ ئیمان تێك دەگیرێن، دووربن، دەبێ پێشێ ئەو بووناسییەیان هەبێ، کە لە قورئاندا خراوەتە ڕوو، بەتایبەت چۆن باسی خوا کراوە؟ ئنجا باسی فریشتەکانی خواو، کتێبەکانی و، پێغەمبەرە هەڵبژاردەکانی سەلامی خوایان لێبێ و، ڕۆژی دوایی و، بەهەشت و دۆزەخ و ...هتد، پێویستە سەرەتا ئەو بووناسیی و بەرچاو ڕوونییە هەبێ، ئنجا دەگونجێ ئیمانێکی ڕاست و دروست و مەحکەم، لەسەر بناغەی ئەو بووناسییە بنیات بنرێ.

ئێستاش کاتی ئەوەیە بچینە سەر باسی یەکەم لە بەشی یەکەم:

## باسی یەکەم

## خوا ناسیی
## خوا (عزَّ وجل) تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە

### بڕگەی یەکەم:

**خوا تاکە بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگارەو، ئەوە گەورەترین ڕاستیی خوارسکە لە دەروونی مرۆڤداو، مەزنترین حەقیقەتی عەقڵییە[1]:**

دەتوانین زۆر بەڵگان لە قورئانیِ بهێنینەوە، لەسەر ئەوە کە ناسینی خوا: وەك بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگار، گەورەترین ڕاستیی خوا ڕسکە لە دەروونی مرۆڤداو، مەزنترین حەقیقەتی عەقڵییە.

---

(١) ئیمان بەخوا بریتیە لە هەڵوێست وەرگرتنی ئیجابیی لەبەرامبەر خوادا، چونکە مەرج نیە هەرچی ئیعتیقادی بەبەدیهێنەرایەتیی خواو، خاوەنداریّتیی خواو، پەروەردگاریّتیی خواو، پەرستراویّتیی خوا بوو، ئیمانیشی پێی بیّ، بەبەڵگەی ئەوە کە ئیبلیس ئەو هەموو مشت و مڕەی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا کردوە، کەواتە: ئیبلیس باش خوا دەناسیّ، بەڵام ئایا ئیبلیس بە بڕوادار لەقەڵەم دەدریّ؟ بێگومان نەخێر، هەرچەندە زۆربەی هەرە زۆری خەڵك وا دەزانن: زانیاریی هەبوون بە خوا، بریتیە لە ئیمان بەخوا، کە ئەمە وا نیەو ئەگەر وا بووایە، دەبوو ئیبلیس لە هەموو کەس ئیماندارتر بیّ! بەڵام دوایی باسی دەکەین کە ئیمان بریتی نیە لەوەی تۆ بزانی خوا هەیە، بەڵکو بریتیە لە قبووڵ کردنی خوا سبحانە و تعالى وەك بەدیهێنەرو پەرستراوو مشوور خۆر، قبووڵی بکەی بەدڵ و بە زمان دانی پێدا بێنی و، بە ئەندامەکانیش بەپێی ئەوە کە ئەو ئیمانە دەیخوازیّ، ڕەفتار بکەی.

ئەمانەش چوار نموونەن لەو ئایەتانەی کە دەتوانین بەبەڵگەیان بهێنینەوە لەسەر ئەوە کە ئیعتیقاد بە بەدیهێنەرایەتسی و خاوەنداریّتیی و پەروەردگاریّتیی خوا، شتێکی ڕۆچوویە لە خوارسکی مرۆڤدا، لە سروشتی مرۆڤداو، شتێکە کە عەقڵی سەلیم زۆر بە ئاسانی ئەوە دەگەیەنێ:

١- پێنج یەکەمین ئایەتێك کە بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دابەزیون، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ ﴾ العلق

ئەمە بەڵگەیە لەسەر خوا ڕسك بوونی ناسینی خوا، لە جەوهەری مرۆڤدا، چ لە دەروونییدا، چ لە عەقڵیدا، بەبەڵگەی ئەوە کە خوا سبحانه و تعالى یەکسەر پێغەمبەری خاتەم دەدوێنێ و دەفەرموێ:

بخوێنە، بەناوی ئەو پەروەردگارەت کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە {دوایی لەنێو هەموو شتەکاندا درووستکردنی مرۆڤ دیاریی دەکات} ئەو زاتەی ئینسانی لە خوێن پارە دروست کردوە....

کەواتە: ئیعتیقاد بە بوونی خوا سبحانه و تعالى: بەبەدیهێنەرایەتیی و، خاوەنداریّتیی و، پەروەردگاریّتیی خوا، شتێکی ڕۆچوویە لە سروشت و خوا ڕسکی مرۆڤـداو، عەقڵی سەلیمیش زۆر بە ئاسانیی دەیناسێ.

٢- یەکی دیکە لەو بەڵگانە، ئەوەیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ ﴾

الأعراف

واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت لە پشتی ڕۆڵەکانی ئادەم، وەچەکەیانی وەرگرت و لەسەر خۆیانی کردن بە شاهێد، لێی پرسین: ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: با، شاهێدییمان دا...[1].

ئەمەش وێنا کردنی ناسینی خوایە، لە عەقڵی مرۆڤەکاندا، واتە: لە عەقڵی سەلیمدا.

٣- یەکی دیکە لەو ئایەتانەی بەڵگەی ئەو بابەتەن: خوای کارزان دەفەرمویٔ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم

واتە: ڕووی خۆت ڕێك ڕاست بکە، بەرامبەر بە ئایین بە پاکیی (دوایی ئایین بەوە تەفسیر دەکات) ئەو خوارسکەی کە خوا خەڵکی لەسەر ڕسکاندوە گۆڕان نیە بۆ دروستکراوی خوا، ئا ئەوەیە ئایینی ڕاست و ڕێك.

کەواتە: فیترەت و شەریعەت، دوو ڕووی دراوێکن.

٤- یەکێکی دیکە لەو ئایەتانە ئەم ڕستە قورئانییەیە: ﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿١٠﴾ ﴾ إبراهيم

واتە: پێغەمبەرەکانیان گوتیان: ئایا لە بوونی خوادا دوودڵیی هەیە؟ بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟!

هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ وایان فەرموە، کەواتە: ئەوە ڕاستییەکی سەلمێنراوو نکوولّیی لێنەکراوە.

---

(١) هەندێ لە زانایان باسی ئەوە دەکەن کە خوا سبحانه و تعالى دەستی بە پشتی ئادەمدا هێناوە، هەموو وەچەکانی وەك گەردیلە لە پشتی هاتوونەتە دەرێ، هەندێ فەرموودەش لەو بارەوە هەن، بەڵام من تێبینییم لەسەر ئەوە هەیەو، پێم وایە خوای پەروەردگار لێرەدا ئەوەمان بۆ وێنا دەکات، کە ناسینی خوا لەلایەن مرۆڤەکانەوە، وەك ئەوەیە پەیمانیان لێ وەرگیرابێ و، لەسەر خۆشیان کرابن بە شاهێد، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا باسم کردەوەو بەڵگەی زۆرم لەو بارەوە خستوونە ڕوو.

بەڵێ: دان بە بوونی خوادا هێنان، هەقیقەتێکی فیترییەو، عەقڵی سەلیم زۆر بە ئاسانیی ئەوە دەسەلمێنێ، بەڵکو پێچەوانەی ئەوە لەلای عەقڵی سەلیم ڕەتکراوەیە، چونکە خوا سبحانە و تعالی مرۆڤی وا خوڵقاندوەو پێکهاتەی دەروون و عەقڵی مرۆڤی وا هەڵخستوە، کە بەدەروون و فیترەت بۆ خوا تینووەو عەودالە.

کەسێك کە کاتی خۆی مولحید بووە، بۆی گێڕامەوە گوتی: لەسەردەمی ڕژێمدا، مارکسیی و ماددییەکی زۆر تۆخ بووم، دانم بە هیچ شتێکدا نەدەهێنا، غەیری ماددە، زۆر کارتێکراو بووم بە فەلسەفەی مارکسیی، گەنج بووم و گەرمە تەریقەت بووم لە مارکسیزمدا، ئەوەبوو گرتیانم و دەستیان بەستم و هەڵیاندامە شوێنێك، کە ئینسان نەیدەتوانی تێیدا دابنیشێ، یەکەمین وشە کە بەدەمم داهات گوتم: (یا ألله!) دوایی خۆم سەرم لەخۆم سوڕمابوو! من بە حیساب خوا ناناسم، ئەوە چییە؟ ئیدی لەو کاتەوە زانیم: کە ناسینی خوا، شتێکی زۆر قووڵ و ڕۆچووە لە فیترەتی ئینسانداو، هەرچەندە بیەوێ بیشارێتەوە، ناتوانێ، بەتایبەت لەکاتی تەنگانەندا کە ئینسان ئاتاجیی خۆی بۆ بەدیهێنەری زۆر بۆ دەردەکەوێ، لەوێدا ئەم فیترەتە سەر دەردێنێ.[١]

ئنجا لەڕووی عەقڵییشەوە: هەردووك یاسای عەقڵیی:

١- {هەموو پەیدا بوویێك پەیدا کەرێکی هەیە} ٢- {هەموو ڕێکخراوێك ڕێکخەرێکی هەیە} هەرکەس میزاجی عەقڵ و هۆشی تێك نەچووبێ، ناچاری دەکەن بڕوا بە خوای بەدیهێنەرو پەروەردگار بێنێ، چونکە: ئەگەر بۆ سەعاتێك یان هەر ئامێرێك کەسێ بڵێ: ئەمە کەس دروستی نەکردوە، خەڵك پێی دەڵێن: شێت بووە! کەچی سبحان الله! بەس توێژاڵی سەرەوەی مێشکی مرۆڤ، چواردە (١٤) ملیار خانەیەو، هەموو مێشکی مرۆڤ لە سەد (١٠٠) ملیار خانەی دەماریی (عصبي) پێك هاتوە[٢]، دیارە ئەمە بەتەقدیریی دانراوە، نەچوون

---

(١) ئەو کەسە بەڕێز: دکتۆر بەرهەم ئەحمەد صاڵح سەرۆکی کۆماری ئێستای عیراقە و، دوای وەرگرتنی مۆڵەتی خۆیشی لێرەدا ناوم هێنا.

(٢) بڕوانە: إبداع الرحمن في جسم الإنسان، د. منصور أبو شريعة العبادي، ص ١٩٨.

دانە دانەی بژمێرن! ئنجا هەر کام لەو خانانە، چ خانەی مێشك، چ ئەوانەی دیکە[1]، زۆر زۆر وردەکاریی زیاتر تێدایە[2]، لە هەر شتێك کە بەشەر دروستی کردبێ، بۆ وێنە: لە ئاڵۆزترین کۆمپیوتەر، کەچی وەرە قەناعەت نەهێنی بەوەی کە کۆمپیوتەرێك، یان سەعاتێك، لەخۆوە دروست بووە، بەڵام بڕوات وابێ مرۆڤ لەخۆوە دروست بێ!!

یان بۆ وێنە: ئینسان گوڵێکی نایلۆن ببینێ، یان سێوێکی نایلۆن، یان هەر میوەیەك کە لە نایلۆن یان پلاستیك دروست دەکرێ، دەڵێ: ماشەڵڵا چەند جوانیان دروست کردوە! بەڵام گوڵێك کە خوا خوڵقاندوویەتی کە ژیانی هەیە، بۆنی هەیە، نەش و نمای هەیە، یاخود میوەکە تامی هەیە، گەشە دەکات، سوودی هەیە، پڕە لە ڤیتامینات، کەچی وەرە مرۆڤ ڕێگا بەخۆت بدەی، قەناعەتت وابێ کە ئەم میوە پلاستیکییە دروستکراوە، کەسێك دروستی کردوە، بەڵام ئەوەی کە ژیانی تێدایەو، تامی هەیەو، بۆنی هەیەو، گەشەو نەش و نما دەکات، پێویستیی بە هیچ کەس نیە، دروستی بکات! لەگەڵ ئەوەشدا زۆر زۆر جیایە لەگەڵ ئەوی دیکە!

یان کەسێك بووکە شووشەیەك ببینێ لە شوێنێك دەڵێ: ئەوە لە کارگەیەك دروست کراوە، ئەدی مرۆڤێك بەو هەموو ئاڵۆزییەوە، دەگونجێ بێ بەدیهێنەرو ڕێکخەرو خاوەن بێ؟!

بەڵێ بەڕاستیی خوێنەرانی بەڕێز! ناسینی خوا، هەم لە فیترەت و دڵ و دەروونی مرۆڤدا، هەم لە عەقڵی مرۆڤدا، شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

---

(١) پسپۆڕانی توێکاریی (تشریح) خانەکانی جەستەی مرۆڤێك بە سەد ترلیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) خانە مەزەنە دەکەن، بڕوانە: بیولوجیا الإنسان، د. حمید أحمد الحاج ص ٧٣، ط٣/٢٠١٧، دار المسیرة، هەروەها بڕوانە: (العظمة في کل مکان) هارون یحیی، ص١١٤/ط١- ٢٠٠٣م.

(٢) هەر خانەیەك لە دەوری سەد ترلیۆن (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) گەردیلە (ذرة) پێکهاتوە، بڕوانە: التطور، نظریة علمیة أم أیدولوجیا؟، أ.د عرفان یلماز، ص٣٢٢، ط١- ٢٠١٣/ دار النیل.

برگەی دووەم:

خوا سبحانە و تعالی پاکە لە هەموو کەم و کوڕییەك و، تێرو تەواویی ڕەهای هەیەو، هەموو دروستکراوەکان خوا بە پاك دەگرن و ستایشی دەکەن:

لەزۆر ئایەتەکانی قورئاندا، خوا سبحانە و تعالی ئەوەی ڕوون کردۆتەوە {ئەو شێوە ناسینەی خوا} چونکە بەڕێزان! قورئان تەعبیری کردوە لە ناخی مرۆڤ، من زۆر جار کە سووڕەتی (الفاتحە) دەخوێنم لە نوێژدا، لەبیرم دەچێتەوە کە ئەوە فەرمایشتی خوایە، وا دەزانم هەڵقوڵاوی دەروونی خۆمە:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾﴾ الفاتحة.

مەبەستم ئەوەیە: خوا سبحانە و تعالی کە فەرمایشتەکانی فەرمووە، تەعبیر دەکەن لە ناخی مرۆڤ، تۆ بێنە هەرچی نووسەرو زاناو شارەزایە، کۆیان بکەوە، ناتوانن سووڕەتێکی وەك سووڕەتی (الفاتحة) بێنن، کە تەعبیر بکات لە شێوەی مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالی.

بە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) دەست پێ دەکات، یانی: ناسینی خوای پەروەردگار، شتێکی سەلمێنراوو ڕوون و ئاشکرایە.

دوایی یەکسەر دێتە سەر ستایشی خوا: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ).

دوایی دێتە سەر مەدح و سەنای خوا: (الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ).

ئنجا دێتە سەر تەمجیدی خوا، کە خاوەندارێتیی ڕەهای هەیە لەدوارۆژدا: ( مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ).

ئنجا دێتە سەر ئەوە کە پێشانی بدات: دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ و تەنیا پشت بە خوا ببەسترێ: ( إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝٥ ).

دوایی داوا لە خوا دەکەن کە بیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست، چونکە بەندایەتیی بۆ خوا، دەبێ لە ڕێیەکی ڕاستەوە بێ: ﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ ﴾.

ئنجا لە کۆتاییدا: پێناسەی پەیڕەوانی ڕاستە شەقامی خواو، لادەران لەو ڕاستە ڕێیە، دەکرێ: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾.

مەبەستم ئەوەیە کە: ئەوەی کە خوا فەرموویەتی دەربارەی چۆنیەتی مامەڵەی مرۆڤەکان لە خزمەتیدا، تەعبیر دەکات لە ناخی مرۆڤ، لەدڵ و دەروونی مرۆڤ، لە ڕووحی مرۆڤ.

ئەمەش چەند ئایەتێك بە نموونە، لەبارەی بەپاکگیرانی خواو ستایشکرانییەوە، لەلایەن دروستکراوەکانیەوە لە ئاسمانەکان و لە زەمیندا:

١- لە سوورەتی (الصف)دا خوای بێوێنە دەفەرموێ: ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ۝١ ﴾ الصف

خوا دەفەرموێ: هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، خوا بەپاك دەگرێ و، خوا زاڵی کارزانە.

٢- لە سوورەتی (التغابن)دا بە (الفعل المضارع) دەفەرموێ: ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۖ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ۝١ ﴾ التغابن.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە خوا بەپاك دەگرێ، موڵك هەر هی ئەوە، ستایش هەر هی ئەوەو لەسەر هەموو شتێکیش بە توانایە.

٣- لە سوورەتی (الجمعة)شدا بەهەمان شێوە، ئەوە ڕاگەیەنراوەکە: خوا سبحانه و تعالی لە هەموو لەکەو پەڵەو کەم و کوڕییەك دوورەو، دروستکراوەکان هەموویان ستایشی خوا دەکەن:

﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ٱلْمَلِكِ ٱلْقُدُّوسِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ ﴾ الجمعة

یەکێ بۆی هەیە پرسیار بکات: کوا مرۆڤەکان وان؟ هی وا هەیە ئەصڵەن هەر ئیمان بە خوا ناهێنێ! دەڵێین: ڕاستە، بەڵام تەنانەت ئەو گەردیلانەی جەستەی مولحیدێکی ملهوڕیشیان لێ پێك دێ، ئەوانیش خوا بەپاك دەگرن و ستایشی خوا دەکەن! زانستیش هەتا بەرەو پێشەوە بچێ، زیاتر ئەو هەقیقەتانەی خوا لە قورئاندا بەیانی کردوون، دەردەکەون، وەك دەفەرموێ:

﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِي ٱلْءَافَاقِ وَفِيٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ ﴿٥٣﴾ ﴾
فصلت

واتە: نیشانەکانی خۆمانیان لە ئاسۆیەکانداو لە دەروونی خۆشیاندا، پێشان دەدەین، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە خوا حەقە {یاخود کە قورئان حەقە}.

بڕگەی سێیەم:

خوا سبحانە و تعالی خاوەنی هەموو ناوە هەرە چاکەکانەو، خاوەنی تێکڕای سیفەتە هەرە بەرزەکانە:

ئەوەش لەزۆر شوێنی قورئان خراوەتە ڕوو، کە خوا (عزّ وجل) هەرچی ناوی چاکە، هەیەتی و، هەرچی سیفەتی بەرزە، هەیەتی، بۆ نموونە:

١- لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی (١٨٠)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾ الأعراف

خوا ناوە هەرە چاکەکانی هەن، ئنجا هەر بە ناوە چاکەکانی لێی بپاڕێنەوەو، واز لەوانە بێنن کە لادان دەکەن لەناوەکانی خوادا، لەمەودوا سزای ئەوەی دەیکەن، وەردەگرنەوە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (الإسراء)، ئایەتی (١١٠)دا، دیسان باسی ناوە هەرە چاکەکانی خوای بێوێنە کراوە: ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ١١٠﴾.

واتە: بڵێ: لە خوا بپاڕێنەوە یان (خوای) بەبەزەیی، بە هەر کامێکیان (لە ناوەکانی) بانگی بکەن، ئەو ناوە هەرە چاکەکانی هەن.

٣- هەروەها لە سوورەتی (طه)، ئایەتی (٨)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ٨﴾.

واتە: خوا جگە لەوی هیچ پەرستراوێك نیە، ناوە هەرە باشەکانی هەن.

٤- هەروەها لە سوورەتی (الحشر)، ئایەتی (٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾ ﴾ الحشر.

واتە: ئەو خوایە، بەدیهێنەرە پەیداکەرە، وێنەکێشە، ناوە هەرە چاکەکانی هەن، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندایە بە پاکی دەگرێ و، ئەو زاڵی کارزانە.

٥- پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ} أخرجه البخاري برقم: (٧٣٩٣)، ومسلم: (٦٩٨٩).

واتە: خوا نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەن، هەرکەسێ بیانژمێرێ (واتە: بە تێگەیشتن و کار پێکردنەوە) دەچێتە بەهەشت.

لە فەرمایشتی دیکەی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، کە خوای بەرزی مەزن، تەنیا ئەو نەوەدو نۆ ناوەی نیە[1]، بەڵام ئەو نەوەدو نۆ (٩٩) ناوە، لە فەرموودەیەکدا دیاریی کراون، هەندێ لە زانایانی فەرموودەناس هێناویانە، بەڵام مشت و مڕ لەسەر سەنەدەکەی هەیە[2]، گرنگ ئەوەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: خوا نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەن، بەڵام نەیفەرمووە: هەر ئەوەندەی هەن.

---

(١) {أَللّهم أسألك بكل اسم هو لك، سميت به نفسك، أو أنزلته في كتابك، أو علمته أحداً من خلقك، أو استأثرت به في علم الغيب عندك، أن تجعل القرآن ربيع قلبي ونور صدري، وجلاء حزني وذهاب هَمّي} أخرجه أحمد برقم: (٤٣١٨)، قال الهيثمي (١٣٦/١٠): رجاله رجال الصحيح غير أبي سلمة الجهني، وقد وثقه ابن حبان، وابن أبي شيبة برقم (٢٩٣١٨)، والطبراني برقم (١٠٣٥٢)، والحاكم برقم (١٨٧٧) وقال: صحيح على شرط مسلم، وصححه الألباني في تخريج (الكلم الطيب) ص ٧٣.

(٢) أخرجه الترمذي: (٣٥٧٠)، والسيوطي في الجامع الصغير: (٢٣٦٧) و (٢٣٦٨) و (٢٣٦٩).

بەنسبەت ئەوەشەوە کە خوا خاوەنی سیفەتی هەرە چاك و، هەرچی سیفەتی باشە، هی خوایە، ئەوەش بە چەندان تەعبیر لە زۆر شوێندا هاتوە، بۆ وێنە:

لە سوورەتی (الروم) ئایەتی (٢٧)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهۡوَنُ عَلَيۡهِۚ وَلَهُ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ﴾ الروم

واتە خوا ئەو کەسەیە کە درووستکراو دێنێتە دی و دەشیگێڕێتەوەو، لەلای ئاسانتریشەو، سیفەت و وەسفی هەرە بەرز لە ئاسمانەکان و زەویدا هی ویەو، ئەو زاڵی کارزانە.

جیاوازیی لەنێوان ناوەکانی خواو سیفەتەکانی خوادا -کە ئەم باسە پێویستی بە شوێنی تایبەت دەکات - جیاوازیی سەرەکییان ئەوەیە کە ناوەکانی خوا سبحانە و تعالی، وەك نیشانە (عَلَم) خوای پەروەردگاریان پیٚ دەناسێنریٚ و، لە هەمان کاتدا کە ناویشن، سیفەتیشن، هەرچی ناوە بۆ خوا، دەشگونجیٚ وەك سیفەت بۆ خوا بەکار بیٚ، بەڵام مەرج نیە هەرچی سیفەت بیٚ بۆ خوا، بگونجیٚ وەك ناو بۆ خوا بەکار بهێنریٚ.

## بڕگەی چوارەم:

### خوای تاك و پاك وەك هیچ كام لە دروستكراوەكانی ناچێ و، هیچ كام لە دروستكراوەكانیشی وەك وی ناچن، لە هیچ شتێكدا:

ئەمەش چەند ئایەتێكی قوڕئانی بەرزو بەپێز لەو بارەوە، وەك نموونە:

١- خوا سبحانه وتعالى لەسوورەتی (الشورى) ئایەتی (١١)دا دەفەرمویٚ: ﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ ﴾ الشورى.

واتە: (خوا) بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوییە، لە خۆتان هاوسەری بۆ هێناونە دی، {ئەگەر دوێنراوەكان پیاو بن، یانی: ژنانی بۆ هێناونە دی و، ئەگەر ئافرەت بن، یانی: پیاوانی بۆ هێناونە دی} هەروەها ئاژەڵەكانیشی بە جووت خوڵقاندوون {ئەصڵەن بە زەینتاندا نەیەت خوای تاك ڕەگەزی هەبێ} هیچ شتێك وەك خوا نیە {لەنێو ئەو سیفاتانەدا كە لە خوا نەفی دەكرێن، بریتیە لە: هەبوونی ڕەگەز} خوا بیسەری بینەرە.

٢- لە سوورەتی (طه) لە ئایەتی (١١٠)دا فەرموویەتی: {ئەم ئایەتەش تەواو ڕێگرییمان لیٚ دەكات، بەهیچ جۆرێك تەماحی ئەوەمان هەبیٚ، خوا بێنینە نێو زەینی خۆمان و وەهم و عەقڵی خۆمانەوە} ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ﴾ طه.

واتە: (خوا) ئەوەی لە پێشیانەوەیەو ئەوەی لە دوایانەوەیە {یاخود ڕابردوویان و داهاتوویان} دەزانیٚ و، زانیاریی ئەوان ناتوانیٚ دەوری خوا بدات.

واتە: ناتوانن پەی بە چییەت (ماهیة)ی خوا بەرن، نەك پەی بە بوونی خوا، پەی بە بوونی خوا دەبردریٚ، فیترەت و عەقڵی ئینسان بۆ خوا تینوون،

بەڵام حەقیقەت و چییەتەکەی، چۆنە؟ ئەوە لەسەرووی ئەوەوەیە کە مرۆڤ بیزانێ، وەك لە دەرسەکانی پێشووشدا باسمان کردوە: ئێمە هەقیقەتی زۆر لە دروستکراوەکانیش نازانین، کە دەڵێم: زۆر لە دروستکراوەکان بۆ وێنە: ڕووح، هێزی موگناتیسیی، هێزی کێشندە، زۆر شتی دیکەش، بەڵکو ئێستا کە زانست زۆر بەرەو پێشەوە چووە، ئەو ماددەیەی کە پارچەی بچووکیی و خشتی بناغەی {گەردیلە (Atom) (ذرة)}یە، ئەو گەردیلەیەش خۆی بەرهەست نیەو تەنیا بە شوێنەوارەکانی دەزانرێ هەیە، ئنجا وزەو ماددە، جیاوازییان چییە؟ زانایان ئێستا تووشی سەراسیمەیی بوون، چونکە ماددەش کە زۆر لێی ورد دەبیتەوە، شتێك نیە بگیرێ، چونکە - وەك گوتمان - گەردیلە کە خشتی یەکەمی دروست کرانی هەموو شتێکە، زانایان هەر بە شوێنەوارەکانی دەزانن کە گەردیلە هەیە، ئنجا لە گەردیلە (گەرد) {جُزَيء - مۆلکۆڵ - Molcol} دروست دەبێ، کە مۆڵکۆڵیش هەر نابینرێ، ئنجا دوای ئەوە، پێکهاتەی دیکە کە بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنیی کە شەش سەد هەزار (٦٠٠،٠٠٠) جار شت گەورە دەکات، دەبینرێ!

ئنجا زانایان بنچینەیەکیان داناوە دەڵێ: {وكل ما جرى ببالك، فالله بخلاف ذلك}، واتە: هەرچی بەدڵ و وەهمی تۆدا دێ، خوا پێچەوانەی ئەوەیە، ئینسان نابێ تەماحی ئەوەی بێ کە خوا بهێنێتە نێو زەین و عەقڵی خۆیەوە! چونکە تەنانەت ئەو ڕووحەی کە لەنێوان دوو تەنیشتەکانی دایە، ناتوانێ بزانێ ڕووح چییە؟ خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا (٨٥) ﴾ الإسراء

واتە: لە بارەی ڕووحەوە پرسیارت لێ دەکەن بڵێ: ڕووح لە کاری پەروەردگارمە {و نازانم، چییە} جگە لە کەمێکیش زانیارییتان پێ نەدراوە.

بێگومان ئەویش هەر دروستکراوەی خوایە، بەڵام بە دڵنیاییەوە کە دروستکراوێکی ماددیی نیە، دروستکراوە ماددییەکە جەستەکەمانە، نوتفەیە کە لە حەیمەنی پیاوو هێلکۆکەی ئافرەت دروست دەبێ، ئنجا دەبێتە نوتفە، ئنجا دەبێتە خوێنپارە (علقة) و زارجوو (مُضغَة) و ..هتد، دیارە کە بەشێوەی پلە پلەیی (تدرّج) دروست دەبێ، بەڵام ڕووح، ئایا خوا پلە پلە دروستی کردوە، یان بەیەکجارو، چۆنە؟ نازانین، گرنگ ئەوەیە خوا ڕووحی پاڵداوەتە لای ئەمری خۆی (أمر)ی پەروەردگاریش مەرج نیە پێویست بە پلە پلەیی بکات، وەك (خلْق) خەلقی خوا پلە پلە دروست دەبێ، بەڵام شتێ بە ئەمری خوا دروست بووبێ {واتە: ئەمری ڕاستەوخۆی خوا، ئەگەرنا هەموو شتێك هەر بە ئەمری خوا دروست دەبێ} مەرج نیە پێویستیی بەپلە پلەیی بێ.

برگەی پێنجەم:

**هیچ شتێك و هیچ کەس، هیچ جۆرە نیسبەتێکی لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالی نیەو هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەخواوە نیە، مەگەر پەیوەندیی دروستکراو لەگەڵ بەدیهێنەر:**

زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی مەزن ئەم ڕاستییەیان ڕاگەیاندوە، بۆ نموونە:

١- لە سوورەتی (مریم) ئایەتی (٩٣)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ ﴾ مریم

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، هەمووی بەبەندایەتیی دێتە خزمەت {خوای} بەبەزەیی.

بەسەرنجدانی مێژوو دەزانین کە: هەم جوولەکەکان، هەم نەصرانییەکان، هەم زۆرێك لە ئەوانەی لە خوا پەرستییدا تووشی لادان و خلیسکان بوون، لەبەر ئەوە تووش بوون، کە پێیان وابووە پەرستراوەکانیان {ئنجا ئەگەر پێغەمبەرانن سەلامی خوایان لێبێ، کە بە هەڵە پەرستوویانن، ئەگەر هەر شتێك و هەر کەسێکی دیکەیە} پەیوەندییەکی تایبەتییان لەگەڵ خوادا هەیە! خەڵکی عەوام و هەندێ لە ئەهلی تەصەووف، هەموویان نا، لێرەدا بەهەڵە داچوون، وەك لە شیعری دەروێشاندا هاتوە:

بۆیە لە دنیا دەستم گرت بەتۆ ... تاکو لە قیامەت نەبم ڕەنجەڕۆ

یانی: وایزانیوە شێخ لە قیامەتێ دەیباتە بەهەشتێ! یان شیعە کە هەندێکیان پێیان وایە: هەرکەس یەك فرمێسکی بۆ (حُسین) ڕشتبێ، حوسەین دەیباتە بەهەشتێ! حیکایەتی سەیر سەیر لەو بارەوە هەن، کە دکتۆر عەلی شەریعەتیی

باسیان دەکات، بۆ وێنە: دەڵێن: هەر کەسێ پارووێك بدات بە کەسێك، لە یادی شەهید کرانی حوسەیندا، حوسەین خوا لێی ڕازی بێ دەیباتە بەهەشتێ! کە ئەوەش هەمووی شوێن کەوتنی ئەوانەی پێشووترە، لە خاوەن کتێبەکان و غەیری وانیش، وەك خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ:

﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ المائدة

واتە: جوولەکەکان و نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی ئەوین!

خوای پەنهانزان هەر لە هەمان ئایەتدا وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ﴿١٨﴾ ﴾ المائدة، واتە: بڵێ: ئەدی بۆچی (خوا) بەهۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان دەدات؟

چەند جاران سزای داون، پەیمانی کۆن بخوێننەوە: هەمووی باسی سزادانەکانی خوایە بۆ جوولەکەکان، خوای بەرزو بێنیاز لەسەر فلان شت و فلان شت، سزای دان، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەدی بۆچی خوا لەسەر گوناهەکانتان، سزای دان، ئەگەر ڕۆڵەی خواو، خۆشەویستی خوان؟!

زۆر گرنگە کە ئێمە بزانین: لە ئیسلامدا هیچ کەس، هیچ ئیمتیازێکی نیە لەلای خوا، ئەوە نەبێ کە بەندەی خوایەو دروستکراوی خوایە، گەر بەهۆی بەندایەتیی بۆ خواوە، بیەوێ لەخوا نزیك بێتەوە، ئەگەرنا هیچ کەس هیچ شتێکی نیە لەگەڵ خوادا.

تەماشا بکەن! خوای پەروەردگار کە مەدحی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات لە چەند مەقامێکدا، بە وەسفی بەندایەتیی (عبودیة) مەدحی دەکات، بۆ وێنە:

١)- دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ ﴿١﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: پاکیی بۆ ئەو کەسەی کە شەوڕۆی کرد بەبەندەکەی خۆی لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ مزگەوتی ئەقصا.

لێرەدا تەنها باسی شەو ڕۆیەکەی دەکات، بەڵام لە سوورەتی (النجم)دا باسی بەرز بوونەوەکەشی دەکات، لەو مەقامە بەرزەدا، بە سیفەتی (عبد) مەدحی دەکات.

**٢)**- لە سوورەتی (الكهف)دا دیسان بە سیفەتی عەبد باسی دەکات، کە قورئانی بۆ دابەزاندوە: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ ﴾ الكهف.

بەڵێ تەنیا لە ڕێگای بەندایەتییەوە ئینسان لە خوا نزیك دەبێتەوەو، پەیوەندییەکی تایبەتیی لەگەڵ خوادا بۆ پەیدا دەبێت، کاتێك کە بۆ خوا ملکەچتر بێ و بۆ خوا صوڵحاوتر بێ، ئەگەرنا لە ئەصڵدا هیچ کەس هیچ ئیمتیازێکی نیە، ئنجا ئەوەش کە لە هەندێ لە کتێبەکانی خۆشماندا باسکراوە لەبارەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەدەوە (صلى الله عليه وسلم) - کە پێم وایە زیاتر لە شیعەکانەوە هاتوە - کە گوایە: خوای پەروەردگار پێشتر ڕووحەکەی خوڵقاندوەو، هەرچی گەردوونە خوا لەبەر پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) خوڵقاندوویەتی!! کە بەتەئکید ئێمە پێمان وایە چاکترین و گەورەترین مرۆڤ و نزیکترین کەس لەخوا، پێغەمبەری خاتەمە (صلى الله عليه وسلم) و، دوای ئەویش پێغەمبەرانی دیکە دێن، سەلامی خوایان لێبێ، بەڵام بەتەئکید ئەوانیش هەر دروستکراوی خوان و، هیچ بەڵگەیەکیش نیە بۆ ئیسپاتی ئەو دەعوایە کە گوایە: خوای کاربەجێ گەردوونی لەبەر خاتری (موحەممەد) (صلى الله عليه وسلم) خوڵقاندوەو ئەم دەقەش: {لولاك لولاك، لما خَلَقْتُ الأفلاك} زانایانی پسپۆڕی سوننەت، بە هەڵبەستراو (موضوع)یان داناوە[1].

ئنجا بێگومان هیچ کەسێك هیچ مافێکی لەسەر خوا نیە، مەگەر خوا بۆخۆی ئەو مافەی بۆ بەندەکانی لەسەر خۆی دانابێ.

---

(١) بڕوانە: (كشف الخفاء ومزيل الإلباس عما اشتهر من الأحاديث على ألسنة الناس) للعَجْلوني، ج٢ ص ٢١٤، برقم: ٢١٢٣، (العَجْلوني) گوتوویەتی: (قال الصنعاني: هو موضوع).

برگەی شەشەم:

خوا سبحانه و تعالى باڵادەستە بەسەر دروستکراوەکانی خۆیداو، لەسەر هەموو شتێك بەتوانایەو، هەرچی بیەوێ دەیکاو، بە هەموو شتێك زاناو شارەزایە:

لەزۆر ئایەتەکانی قورئاندا، خوای تاك و پاك باسی ئەو سیفەتەی خۆی کردوە، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: موڵکی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایەو، خوا لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.

٢- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ ﴾ فاطر.

واتە: بێگومان خوا زانای نهێنیی ئاسمانەکان و زەوییەو، خوا بە نهێنیی سینەکان {دڵ و دەروونەکان} ئاگادارە.

هەروەها ئایەتی دیکەش لەو بارەوە زۆر زۆرن، کە هەرچی هەیە، لەژێر ڕکێفی خوای زاڵ و توانادایە.

ئنجا ئایا لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای پەروەردگار لەڕێی کۆمەڵێك یاساوە کە داینان، دروستکراوەکانی خۆی بەڕێوە دەبات، مانای وایە گەردوونێکی ڕێك و پێك و سیستماتیك (منظم) پێویستی بە خوا نیە؟! بێگومان نەخێر، بیرکردنەوەی واش یەکجار سەرکێڵانەو فامکاڵانەیە، چونکە:

١- یاساو ڕێك و پێکیی (القانون والنظْم) بەبێ یاسادانەرو ڕێکخەر (مقنِّن ومُنَظِّم) مەحاڵە بێتە دی.

٢- خوایەك تبارك وتعالى خاوەنی ئەوپەڕی زانایی و شارەزایی و کارزانیی و توانایی و ...هتد بێ، بێگومان دروستکراوەکانیشی یاسادارو ڕێك و پێك و سیستماتیك دەبن، ئایا خوا عز وجل کاری ناڕێك و پێك پاشاگەردانیی (فوضوي) لێ دەوەشێتەوە؟!

٣- ئایا کاتژمێر (ساعة) یان کۆمپیوتەر، هەر لەبەر ئەوەی سیستمی تێدا دانراوەو، بەڕێك و پێکیی دروستکراوەو کاردەکات، مانای وایە هیچکەس دروستی نەکردوە؟!![1]




---

(١) لە مەوسووعەی: {درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد}دا باش ئەو بیرۆکەو گومانانەی مولحیدەکان بەرپەچ دراونەوە.

برگەی حەوتەم:

خوای بەرزو مەزن هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتیارەو، دروستکراوەکانی خۆی بەردەوام لەژێر ڕکێف و کۆنترۆڵی خۆیدا دەهێڵێتەوەو، تەنانەت چاو تروووکانێك لە دروستکراوەکانی خۆی بێ ئاگا نیەو، خوا سبحانە و تعالی نە ماندوویێتی، نە خەو، ڕێی تێ نابەن:

بەڕێزان!

ئەم مەسەلەیە کە ئێستا بۆ ئێمە شتێکی زۆر ئاشکراو ڕوونە، بۆ بەشەرییەت وا نەبووە، بەر لەوەی قورئان بێ: سوقڕات و، ئەرستۆو، ئەفلاتوون، ئەو سێ فەیلەسووفە کە بە خواناس لەقەڵەم دراون و خواشیان ناسیوە، ئنجا لەپێش مەسیحیشدا بوون، نەك هەر لەپێش ئیسلامدا، ئەوانە قەناعەتیان وابووە کە خوا گەردوونی دروست کردوە، دوایی وەك سەعاتێك قورمیشی کردوەو لێی گەڕاوە!

یانی: دوایی هەقی بەسەریەوە نیە چی لێ دێ و چۆن دەبێ؟ ئەوانە کە لەنێو فەیلەسووفەکانی یۆناندا لە هەموویان عاقڵ تر بوون، ئاوا تەصەووڕیان کردوە! بەڵام ئایا خوای بەرزو مەزن چۆن باسی خۆی دەکات؟

لە سووڕەتی (المؤمنون)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾

واتە: لە سەرووتانەوە حەوت چینمان (یان حەوت ڕێمان) خوڵقاندوون و، ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێ ئاگا نین.

خوێنەرانی بەڕێز!

ئەگەر ئینسان لە خۆی و هەست و نەستەکانی ورد بێتەوە، دەزانێ کە خوا ئاگای لەنێو دڵی هەیە، جاری وا هەیە لەنێو دڵی خۆتدا شتێك لەخوا داوا دەکەی، پێویستییەك خولیایەکت هەیە، خوای بەرزو مەزن وەڵامی ئەوەشت دەداتەوە! کەسێ لەوانەیە بڵێ: ئنجا ئایا ئەو شتە وردانە، پێویست دەکات خوا بیانزانێ، وەك هەندێ لە موعتەزیلە بۆچوونیان وابووە، بەحیساب بۆ ئەوەی بەرگریی بکەن لە دادگەریی خوا، هەروەها هەندێ لە فەیلەسووفەکان گوتوویانە: خوا لەوە گەورەترە ئەو وردە شتانە بزانێ، پێیان وا بووە، زانینی ئەو وردە شتانە، لەخوا ناوەشێتەوە! بەڵام نەخێر، خوا وردو درشتی هەموو درووستکراوەکانی خۆی دەزانێ و، لێشیان بێ ئاگا نیە، وەك لە سووڕەتی (الرحمن)دا، دەفەرموێ:

﴿ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾ الرحمن[1].

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە، داوا لە خوا دەکات، لەهەموو تاو (لحظە)ێکدا ئەو (خوا) کاری هەیە.

بەڵێ خوا بە سیستم ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات، بەڵام خوای باڵادەست مەحکوومی سیستمەکەی خۆی نیە، کە نەتوانێ لێی دەربچێ!

---

(١) وشەی (يَوم) لە لای باو (عُرف)ی ئێمە، یانی: بیست و چوار (٢٤) سەعات، ئەگەرنا لە ئەسڵی زماندا (يَوم) یانی: کات، ئنجا بۆ ئێمە کە لەسەر زەویین (يَوم) دەبێتەوە بە شەوو ڕۆژ، یان بەس مەبەست پێی ڕۆژ (نهار)ە، کە تێکڕا (معدَّل) دوازدە (١٢) سەعاتە، بەڵام (يَوم) لەلای خوای پەروەردگار یانی: کات (وقت)، واتە: هەموو کاتێك خوا لەکارێك دایە، هەروەها لە زمانی عەرەبییدا یانی: (مدة من الزمان أَي مُدَّة كانت) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٥٧٢، ط/٢٠١٢م، المكتبة العصرية.

بۆ وێنە:

١)- ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ دەخرێتە نێو ئاگرەوە، بەپێی سیستم بێ، دەبێ ئاگر بیسووتێنێ، بەڵام خوا ناهێڵێ، دەفەرمویێ:

﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: گوتمان ئەی ئاگر! سارد بەوەو، سەلامەت بە، لەسەر ئیبراهیم.

هەتا هەندێ لە زانایان دەڵێن: بەر لەوەی خوا بفەرموێ: (وَسَلَٰمًا) ئیبراهیم خەریك بوو لەسەرمان ڕەق بێتەوە، دوایی خوا فەرمووی: (وَسَلَٰمًا) یانی: ساردییەکی وا نەبێ زیانی پێ بگەیەنێ، سەلامەتیش بە.

٢)- ئاو وا عادەتە خەڵکی بخنکێنێ، بەڵام بەنو ئیسرائیل کە بەس خوا دەزانێ چەند هەزار کەس بوون، لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: حەوت سەد هەزار (٧٠٠،٠٠٠) کەس زیاتر بوون! بەڵام هەرچۆنێکی بێ، چەند هەزار کەسێك هەر بوون، دێن بەرەو دەریای سوور - کە ئەمە بۆ زانیارییتان هەقیقەتێکی مێژووییەو ئەوانەی بڕوایان بە کتێبەکانیش نیە بۆیان مەتەڵە: بەنو ئیسرائیل چۆن لە دەریای سوور پەڕیونەوە؟ - ئنجا کە دێن: پشتیان سوپایەکەی فیرعەونەو پێشیشیان دەریا، بۆیە گوتیان: ﴿ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الشعراء. واتە: ئێمە گیراوین!

مووساش فەرمووی: ﴿ كَلَّآ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ ﴾ الشعراء. نەخێر، پەروەردگارم ڕێم پێشان دەدا، بەکوێدا بڕۆم؟ ئینسانی ئیماندار هەرگیز ئومێد ون ناکات.

کەواتە: خوا سبحانە و تعالی کات بەکات ئاگای لە دروستکراوەکانی خۆیەتی.

برگەی هەشتەم:

دروستکراوەکان بۆ ویستی خواو یاسای خوا ملکەچن، هیچ دروستکراوێك بە ئەندازەی سەرە ئەنگوستێك، بەڵکو بەقەدەر موویەك، لاملیی ناکات لەو یاسایانەی خوا بۆی داناون و، ناتوانن لە ژێر ڕکێفی ویستی خوا بچنە دەر:

خوا لەزۆر شوێناندا ئەو هەقیقەتەی بەیان کردوە، بۆ نموونە:

خوا فەرموویەتی: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ﴾ الحج.

واتە: ئایا نابینی چۆن هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەبات! هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و، چیایەکان و دارو درەخت و ژیانداران و، زۆرێك لە خەڵکیش و، زۆرێکیش سزایان لەسەر پێویست بووەو هەر کەسێکیش خوا (بەهۆی کوفرو لادانیەوە) سووك و ڕیسوای بکات، هیچ ڕێز لێگرێکی نابێ، بە دڵنیایی خوا هەرچی بیەوێ دەیکات.

بۆیەش خوا فەرموویەتی: زۆر (کثیر) چونکە: مرۆڤـەکان هەندێکیان کڕنووشی بۆ نابەن و بۆ خوا ملکەچ نین، لەو بەشەی کە لەژێر ڕکێفی ئیرادەیاندایە، ئەگەر نا ئەوانەش کە ئارەزوومەندانە (طوعاً) خوا ناپەرستن، لەو بەشەدا کە پەیوەندیی بە ئیرادەیانەوە نیە، بۆ خوا هەر ملکەچن، ئایا گەردیلەکانی جەستەیان، خانەو شانەی کۆ ئەندامەکانیان، هەر بۆ خوا ملکەچ نین و بە قانوونی خوا بەڕێوە ناچن؟

ئایا کافرەکان دەتوانن بە چاو نەبینن؟ یان ئایا دەتوانن وا بکەن، بە گوێ نەبیستن، بە شتێکی دیکە ببیستن؟ ئایا دەتوانن وا بکەن دڵیان لێنەدا؟ یان گورچیلەیان کار نەکات؟ یانی: کۆ ئەندامەکانیان و خانەکانی جەستەیان، بگرە گەردو گەردیلەکانیشیان، ملکەچی خواو ئەو سیستەمەن کە بۆی داناون، با لەو بەشەشدا کە ویستیان پێدراوە تاکو تاقیی بکرێنەوە، بتوانن بۆ خوا ملکەچ نەبن!

برگەی نۆیەم:

خوا چەند یاسایەکی داناون بۆ دروستکراوەکانی خۆی، کە بەسەر هەموو شتێکدا جێبەجێ دەبن، بەڵام وانیە کە خوا سبحانە و تعالی نەتوانێ لەو یاسایانە دەرباز بێ:

لەو بارەشەوە ئایەتی قورئان زۆرن، بۆ نموونە:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾ البروج، واتە: خوا هەرچی بیەوێ، دەیکات.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ ﴾ الحج، بێگومان خوا هەرچی بیەوێ ئەنجامی دەدات.

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ ﴾ المائدة، واتە: بە دڵنیایی خوا چۆنی بوێ، وا بڕیار دەدات.

٤- دیسان دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَحۡكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكۡمِهِۦ ﴿٤١﴾ ﴾ الرعد، واتە: خوا حوکم دەکا هیچ کەس ناتوانێ، بەدوای دابچێ و بڕیارو حوکمەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

٥- هەروەها فەرموویەتی: ﴿ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأنبياء، واتە: خوا لێی ناپرسرێتەوە لەوەی دەیکات و، ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە.

بەڵێ خوای کاربەجێ لە دروستکراوەکانیدا، کۆمەڵێك یاسای داناون، بەڵام بۆخۆی مەحکوومی یاسایەکانی خۆی نیەو، هەر کاتێك ویستی کاریگەریی و بڕشتی ئەو یاسایانە ڕادەگرێ و لەکاریان دەخات، بەڵام بێگومان ئەویش هەر لەڕووی سیستم و حیکمەتێکەوە کە هەر شایستەی خۆیەتی، نەك بە گۆترەکاریی و هەڕەمەکیی.

## بڕگەی دەیەم:

## خوا سبحانە و تعالی لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، چونکە هیچ شتێك وەك خوا نیە.

براو خوشکانی بەڕێز!

مەبەستم لەم بڕگەیە ئەوەیە کە بەداخەوە، وەك چۆن کاتی خۆی جەهمییەو پەکخەران (مُعَطلة) هەبوون، -وەك پێشتر باسمان کرد- کە تێیانپەڕاندوەو، هەندێك لە ئەشعەریی و ماتوریدییەکانیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەرییان و، لە بەپاکگرتن (تَنْزیە)ی خوادا تێیان پەڕاندوە، بەجۆرێك کە سەری بۆ ئەوە کێشاوە، هەندێ لە سیفەتەکانی خوا لابدەن و بەبیانووی (تنزیە)وە، خۆیان تووشی پەکخسن (تعطیل) کردوە، لەولاشەوە: هەندێ لە ئەهلی فەرموودەو ئەهلی خەبەر، بەتایبەتی ئەوانەی کە شوێن کەوتووی مەزهەبی حەنبەلیی بوون، کە حەنبەلییەکان خۆشیان وا دەڵێن- وەك پێشتریش باسمان کرد - بەبیانووی چەسپاندنی سیفەتەکان بۆ خواوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە ناویان ناون سیفەتە هەواڵییەکان (الصفات الخبرية) کە من تێبینییم لەسەر ئەو وشەیە هەیە، بەبیانووی ئەوە: وایان کردوە سەر بکێشن بۆ وێچواندن (تشبیە) و جەستاندن (تجسیم)ی خوا عز وجل.

بۆ وێنە:

ئێستا هەندێ خەڵك کە نازناوی {سەلەفیی}یان هەڵگرتوە، کاتێك دەڵێن: خوا لە ئاسمانە، وا دەزانن ئاسمان دەوری خوای داوە! وەك چۆن شتێك دەخرێتە نێو شتێکەوە!! کە ئەو تەصەووڕە تەصەووڕێکی زۆر هەڵەیە بۆ خوا سبحانە و تعالی، جارێ خوا سبحانە و تعالی بۆخۆی لە چەند شوێنان لە قورئاندا

دەفەرموێ: خوا دەوری هەموو شتێکی داوە[1]: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطًا ١٢٦﴾ النساء.

پاشان کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ ١١﴾ الشورى، هیچ شتێك وەك وی نیە، مانای وایە: ڕێگات نیە هیچ سیفەتێك بۆ خوا بڕیار بدەی، بەو شێوەیە کە سیفەتی دروستکراوەکانە، کەواتە، کە دەڵێین: خوا لە سەرووی دروستکراوەکانیەتی، یانی: خوا سبحانه و تعالی لەدەرەوەی جوغزو بازنەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بەو شێوەیەی کە بۆ خوا شایستەیە، ئنجا خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، بەڵام خوا پێویستیی بە عەرشەکەشی نیە، چونکە ئەگەر بڵێی: خوا پێویستیی بەو عەرشەیە کە لەسەریەتی، کە جارێ نازانین، لەسەر عەرش بوونی خوا، یانی چیی؟ ئێمە دەڵێین: خوا بەرز بۆوە بۆ سەر عەرش، نیشتەجێ بوو لەسەر عەرش، لەسەر عەرشە، ئەمە مانایەکەی وایە، بەڵام بۆ خوا عز وجل واتایەکی هەیە کە بۆ خوا شایستەیە، وەك پێشەوا مالیك کە لەو بارەوە پرسیاری لێکرا، گوتی: {الِاسْتِوَاءُ مَعْلُومٌ، وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ، وَالْإِيمَانُ بِهِ وَاجِبٌ، وَالسُّؤَالُ عَنْ الْكَيْفِيَّةِ بِدْعَةٌ} واتە: (إستواء) زانراوە، چۆنیەتییەکەی نەزانراوە، بڕوا پێهێنانی فەرزە، پرسیار کردن لەبارەیەوە داهێنراوە.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٥٤﴾ الأعراف، یان دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ٨٤﴾ الزخرف.

یانی: خوا لەسەرەوەیە، یانی لەدەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بۆیە زانایان گوتوویانە: {مستوٍ على عَرْشِهِ، بائنٌ عَن خَلقه}، واتە: خوا لەسەر بارەگای خۆیەتی، بەڵام لەدەرەوەی بازنەی دروستکراوەکانیەتی.

---

(١) هەڵبەتە دەورە دان (إحاطة) بە چەمك و واتایەکی شایستەی خوا عـز وجـل، نەك ئەوەی دێتە زەین و خەیاڵی ئێمەی مرۆڤەوە.

ئنجا پێشتریش گوتمان: مرۆڤ ڕووحەكەی كە لەنێوان دوو تەنیشتەكەی دایە، نازانێ چییەو چۆنە؟! كە بەدڵنیایی ڕووح لەنێو جەستەدایە، بەبەڵگەی ئەوە كە هەر كەسێ مردووێكی بینیبێ، هەست دەكات پێشێ پێیەكانی سارد دەبن، دوایی وردە وردە ئەندامەكانی ڕووحیان تێدا نامێنێ تاكو دەگاتە: حاڵەتی غەرِ غەرە، دوایی زاری دەكرێتەوە دەردەچێ و، پاشان دەم بەیەكدا دەدات.

كەواتە: شتێكی بێ جێیە مرۆڤێك بە ڕووحی نێو جەستەی ئاشنا نەبێ و، چییەت (ماهیة)ەكەی نەزانێ، تەماعی پەیپێبردنی چییەتی خوای هەبێ!

### بڕگەی یازدەیەم:

### خوا تبارك و تعالى: یەکەمینەو دواهەمینەو ئاشکراو پەنهانە:

خوا عز وجل لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْآخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾﴾ الحدید، واتە: ئەو (خوا) یەکەمە {بەبێ سەرەتا، بەبێ دەست پێ کردن} و دواهەمینە {بێ ئەوەی کۆتایی بێ} و ئاشکرایە {بەبێ ئەوەی ببینرێ} و پەنهانە {بەبێ ئەوەی بگونجێ نکووڵیی لێ بکرێ} و ئەو بە هەموو شتێك زانایە.

هەندێك لە زانایان دەڵێن: کە خوا دەفەرموێ: (وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ) ئاشکرایەو پەنهانە (وَٱلظَّٰهِرُ) یانی: ئاشکرایە بۆ کەسێك کە بەچاوی عەقڵ و دڵ و فیترەت بۆی بگەڕێ، دەیبینێ، بەڵام (الباطـن) پەنهانە بۆ کەسێ بیەوێ بەچاوی سەر بۆی بگەڕێ، نایبینێ.

بۆیەش هەموو ئەوانەی کە مولحیدن و بێ بڕوان، لەبەر ئەوەیە کە: ویستوویانە وەك چۆن پەی بە شتێکی ماددیی دەبەن، ئاوا پەی بەخوا ببەن!

بەڵام ئەی مرۆڤـ! چۆن تەماعی بینینی خوای بێوێنەت هەیە، لە حاڵێکدا ڕووحەکەی خۆتت بۆ نابینرێ؟ هەروەها ئەو قسەیەی کە یەکێك بۆ یەکێکی دیکەی دەکا، کە دەگاتە گوێگر، بەس دەنگەکەی دەگاتێ، بەڵام مانایەکەی دوای ئەوەی کە دەنگەکەی بەرگوێی دەکەوێ و، لە ڕێی هەواوە دەگوازرێتەوەو بەهۆی لەرینەوەی پەردەی گوێ و چەکوش و سندانەوە، ئەو مانایە دەگاتە مێشك و تەحلیلی دەکات، بێگومان مانایەکەی بە هیچ کام لە پێنج هەستەکان هەستی پێ ناکرێ {مەبەستم مانای قسەکانە، نەك دەنگەکان} دەنگەکە بەس گەیەنەری مانایەکەیە، بەڵێ ئێمە تەنانەت هەندێ لە شتە ماددییەکانیش، ناتوانین بیانحەجمێنین و بە پێنج هەستەکانمان هەستیان پێ بکەین، چ جای خوای بەرزو مەزن و بێ وێنە!

باسی
دووەم

## گەردووناسیی

## خوا گەردوونی بە هەق دروستکردوەو، هەموو شتێکیشی بەو پەڕی ڕێك و پێکیی و وردەکاریی، وەدیهێناوە

خوای بەدیهێنەر وشەی: (خلق)ی بەکار هێناوە، بۆ کۆی دروستکراوەکانی، وشەی (خلق)یش چاوگەو بەمانای (مخلوقات)ە.

خوا پشتیوان بێ ئێمە گوشراوو پوختەی ئەم باسی دووەمە، لە هەشت (٨) بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### بڕگەی یەکەم:

**دروستکراوەکان لە بچووکترینیانەوە تاکو گەورەترینیان، هەموویان دروستکراوی خوان، بەبێ هەڵاواردن و، خوا سبحانە و تعالی بەدیهێنەرو خاوەن و مشوورخۆری هەموو شتێکە:**

ئەوەی تا ئێستا بۆ ئێمە دیارە: بچووکترین شت کە تا ئێستا بۆ زانست ئاشکرا بووە گەردیلەیە[1]، کە بە زمانی بیانیی: {Atom}ی ئەتۆمی پێ دەڵێن،

---

(١) هەڵبەتە گەردیلە (ذرة)ش لە سێ پێکهاتەی سەرەکیی: پرۆتۆن، نیوترۆن، ئەلیکترۆن

کاتی خۆی وشەی ئەتۆمیان بەکار هێناوە بۆ ئەو شتە وردیلەی کە لەت ناکرێ، کە بەتەئکید ئەوەی کە کاتی خۆی فەیلەسووفانی یۆنان بەکاریان هێناوە، مەبەستیان پێ ئەو گەردیلەیەی ئێستا نەبووە، کە بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنییش نابینرێ، کە زیاتر لە (٦٠٠،٠٠٠) جار شت گەورەدەکات، مەبەستیان ئەوە نەبووە، بەڵکو مەبەستیان پێی گەرد (هباء) بووە بەعەرەبی، واتە: ئەوەی کاتێ تیشکی خۆر دێتە ژوورێ لە پەنجەرەیەکەوە، دەیبینی، یان ئەگەر چاو زۆر ورد بکەیەوە ئەو شتە بچووکانە دەبینی، بەوەیان گوتوە (ذرة)، بەڵام ئێستا {ئەتۆم} (ذرة)، کە بە کوردیی ئێمە پێی دەڵێین {گەردیلە}، لە زانستی فیزیادا چەمك و واتایەکی دیکەی هەیە.

دیارە بە چەند گەردیلەیەك (گەرد)ێك پێك دەهێنن، کە پێی دەگوترێ: مولکۆڵ (Molcol) (جُزَيء) ئنجا ئێستا مولکۆلیش نابینرێ، چ جای گەردیلە!

زانایانی فیزیا بۆ وێنا کردنی بچووکیی گەردیلە گوتوویانە:

ئەگەر قەبارەی گەردیلەیەك هێندەی قەبارەی خڕۆکەی زەوی گەورە ببێ، ئنجا قەبارەی نێوکی گەردیلە (پرۆتۆن و نیوترۆن) هێندەی تۆپ (كُرَة)ێکی پێی لێدێ، بەڵام قەبارەی (ئەلیکترۆن) هێندەی ئەو تۆزو گەردەی لێدێ کە لەپەنجەرەداو لەبەر تیشکی خۆردا دەبینرێ!!

ئەوانە بچووکترین دروستکراوی خوان، ئنجا گەورەترینی دروستکراوەکان، ئەوەی کە تا ئێستا هەیە: کەهکەشانەکان و گەلە کەهکەشانەکانن، یانی: بەچەند کەهکەشانێکیش شتێکی دیکە پێك دێنن، پێی دەگوترێ: گەلە کەهکەشان.

ئنجا هەر لەو دروستکراوە گەورانەوە، تاکو ئەو دروستکراوە وردو بچووکانە، هەموویان خوا دروستی کردوون، واتە: لەنەبوونەوە هێناونیە دی.

---

دروست بووەو پرۆتۆن و نیوترۆنیش لە پێکهاتەی گچکەتر، کە (کوارك)ەکان (الکوارکات - Quarks)ن، بەڵام گەردیلە بە خشتی یەکەمی ماددە دادەنرێ.

زانستی فیزیای ئێستا باسی ئەوە دەکات کە ئەم گەردوونە چۆن دروست بووە؟! گوایە لە: تەقینەوەی گەورە (الإنفجار الكبير) {The Big Bang}ەوە، کە بەمەزەندە دەڵێن: سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن: (١٣،٨٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ساڵ لەمەو پێش، ئەوە ڕووی داوە، ڕەنگە لە هەندێ سەرچاواندا بڵێن: سێزدەو نیوو، هەندێکی دیکە بڵێن: (١٥) ملیار، کەمتر، یان زۆرتر، دەڵێن: کاتی خۆی کە ئەو تەقینەوە گەورەیە، ڕووی داوەو ئەم گەردوونەی لێ هاتۆتە دی، دەشڵێن: ئەوەی کە تەقیوەتەوە بەناوی: سینگولارتی (singularity) (المفردة - تاکی گەردوونیی)[1] شتێکی هێندە بچووك بووە، ملیاران جار لە گەردیلەش

---

(١) زانایانی فیزیا چەند ناوێکیان بۆ داناون وەك:

١- تۆوی گەردوون (بِذرة الكون).

٢- هێلکەی گەردوونیی (البيضة الكونية).

٣- تاکبووەوە (المُتَفَرِّد).

شایانی باسیشە ئەو تاکی گەردوونییە خاوەنی چڕییەك (كثافة)ی ڕەها بووەو بەپێی سنووری بلانك (حَدُّ بلانك) یان نەگۆڕی بلانك (ثابت بلانك) بووە، کە زانایان لەوە بچووکتریان نەدۆزیوەتەوە بۆ پێوان، ئەویش بریتیە لە:

{ ١٠^٣٢ کالفن بۆ گەرمیی و، ١٠^-٤٣ چرکە بۆ کات و، ١٠^-٣٥ مەتر بۆ ماوە (مسافة)}

مەبەستیش لە سنووری بلانك یان نەگۆڕی بلانك (ثابت بلانك)، بە کورتیی ئاوایە:

ئەو {سینگولارتی- singularity (تاکی گەردوونیی)}یەی - کە بەپێی بیردۆزەی {Big Bang-تەقینەوەی مەزن} - بە چاوگ و سەرەتای دروستبوونی گەردوون دادەنرێ:

١- لە ڕووی گەرمییەوە: (١٠)^٣٢ پلەی کالفن گەرم بووە، {پلەی کالفن = (-٢٧٣،١٦) پلەی گەرمیی سەدییە، واتە: (٢٧٣،١٦) لە ژێر سفرەوەیە}، ئاشکراشە ژمارە (١٠) سی و دوو سفری لە پێشەوە بێ (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) گەرمییەکی بێ سنوور دەگەیەنێ.

٢- لە ڕووی کاتەوە لە ماوەی (١٠^-٤٣)ی چرکەیەکدا تەقیوەتەوە، واتە: چرکەیەك دابەش بکەی بۆ ژمارەیەك کە چل و سێ (٤٣) سفری هەبێ:

(١٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)، ئنجا لە یەکێك لەو بەشانەدا، ئەو یەکەی گەردوونییە تەقیوەتەوە!

٣- لە ڕووی قەبارەوە: (١٠^-٣٥) مەترێك بووە، یانی: مەترێك دابەش بکەی بۆ ژمارەیەك کە: سی و پێنج (٣٥)ی سفری هەبێ (١٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠)،

بچووکتر بووە! ئنجا نازانم شتێك هێندە بچووك بێ، ئەگەر نەبوون (عَدَم) نەبێ، چییە؟! بەڵام هەر نایانەوێ دان بەو ڕاستییەدا بێنن کە خوا عز وجل گەردوونی لە نەبوون (عَدَم) هێناوەتە دی!

لە سووڕەتی (الأنبیاء)دا خوای پەروەردگار ئاماژەیەك بە هەرکام لە سەرەتای درووستبوونی گەردوون و کۆتاییەکەیشی دەکات، بەنسبەت سەرەتای دروستبوونیەوە فەرموویەتی:

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبیاء.

واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان نەیاندیوە (دیتنی بە عەقڵ و دڵ) کە ئاسمانەکان و زەمین پێکەوە جۆشدراو بوون و، کت و پڕ لە یەکمان جیا کردنەوە!

ئنجا بە نسبەت کۆتایی و سەرەنجامەکەشیەوە فەرموویەتی: ﴿ يَوْمَ نَطْوِى ٱلسَّمَآءَ كَطَىِّ ٱلسِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

واتە: ئەو ڕۆژەی ئاسمانەکان دەپێچینەوە {وەك چۆن تۆپە قوماشێك دەپێچرێتەوە} بەوێنەی تۆمارێك کە نووسراوە، {ئاوا ئاسمانەکان دەپێچینەوە} وەك چۆن لەسەرەتاوە گەردوونمان دروست کرد، ئاوا دەیگێڕینەوە بۆ حاڵەتی یەکەمی، ئەوە بەڵێنە لەسەر ئێمە، بە دڵنیایی ئێمە ئاوا دەکەین.

بەڵێ گەردوون (خوا) لە نەبوونەوە هێناویەتی و، ئەو بیردۆزە فیزیاییەش هەر پشتگیریی ئەوە دەکات، هەرچەندە هەقیقەتەکانی وەحیی پەکیان لەسەر ئەوە نەکەوتوە، بیردۆزەی زادەی بیرو هۆشی مرۆڤ، پشتگیرییان بکات، بەڵام وەك بەرچاو ڕوونییەك، دەگونجێ سوودی لێ ببینرێ.

---

ئنجا یەك بەشی ئەوە، قەبارەی ئەو تاکی گەردوونییە بووە!
بڕوانە: الکون بین القرآن والعلم، م. محمد عصام قصاب، ص٤١و ١٠٤، ط١/ ٢٠١٥م، دار الفکر - دمشق، دار الفکر المعاصر- بیروت.

ئنجا زۆر ئایەت هەن لەو بارەوە کە خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە بۆ نموونە: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمر.

واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرو سەرپەرشتیارە.

بۆیەش جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە، چونکە بیردۆزەیەکی فەلسەفیی هەیە، بەڵکو بەشێك لە فەیلەسووفە مسوڵمانەکانیش، بڕوایان وابووە کە گەردوون ئەزەلییە، بەڵام بە جۆر نەك بە تاك تاك {بالنوع لا بالعين} واتە: زنجیرەی دروستکراوەکان (سلسلة المخلوقات) بە شێوەیەکی بێ کۆتایی بەرەو ڕابردوو درێژ دەبێتەوەو، سەرەتاو دەستپێکی نیە، ئەمە واتای: بەجۆر (بالنوع)ە، کە دەشگونجێ بگوترێ (بالجنس)، بەڵام ئاڵقەکانی دروستکراوەکان (حلقات المخلوقات) هەرکامیان سەرەتاو کۆتایی (مبدأ و منتهى)ی هەیەو هەموویان نەبوون (عدم)یان پێش کەوتوە!

هەڵبەتە هۆکاری پەیدابوونی ئەو بیرۆکەیەشیان ئەوەیە کە: گوتوویانە: خوا سبحانە و تعالى کە بوونەکەی سەرەتای نیەو، سیفەتی بەدیهێنەرایەتیی و سیفەتی پەروەردگارێتیی لەخوادا، بێ سەرەتان، کەواتە: ئەگەر بڵێی: ئەم گەردوونە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (١٣) ملیار ساڵ لەمەوبەر نەخێر بۆ (١٠٠٠) ملیار ساڵ، -کە کەس وای نەگوتوە، بەڵام بۆ گریمانە- بەڵکو ئەگەر زۆر لەپێش ئەوەشەوە دایبنێی، ئەزەل لەگەڵ هەر ماوەیەکی کات (مدة زمنية) دا بەراورد بکەی، ئەو ماوەیە هەرچەندە زۆر بێ، لەچاو ئەزەل، هەر سفرە، هەروەها لەچاو ئەبەدیش بەهەمان شێوە، ئنجا هەندێ لەو زانایانە دەڵێن: چۆن دەبێ ئەو هەموو کاتە تێپەڕی بێ، خوا هیچی دروست نەکردبێ و، سیفەتی بەدیهێنەرایەتییشی هەر بووەو، بەزەیی بە مەخلووقێکدا نەهاتبێتەوە، لە حاڵێکدا کە سیفەتی بەزەییشی هەر هەبووە؟! ئنجا ئەوە مەسەلەیەکی زۆر قووڵەو من پێم وایە لەهەمووی سەلامەتتر ئەوەیە کە بڵێین: دەبێ ئینسان دان بەوەدا بنێ، کە عەقڵی مرۆڤ لەوە بچووکترە، ئەو شتانە ئیستیعاب بکات، ئەگەر نا (إبن

تیمیە)ش ڕەحمەتی خوای لێبێ لە کتێبی: (منهاج السنة النّبويّة)دا[١]، بەلای ئەو بیرۆکەیەدا دەچێ کە خوای بەرزو مەزن مەرج نیە تەنیا ئەم گەردوونەی خوڵقاندبێ، تەنیا خۆی دەزانێ پێشتریش چەند عالەمی دیکەی خوڵقاندوون!

بەڵام من پێم وایە لە هەمووی سەلامەتتر وایە بڵێین: وەك چۆن ئەم پەرداخە ئەوەندە ئاوەی گرتوە، ئنجا ئایا دەتوانی ئاوی زەریایەك لەخۆیدا کۆ بکاتەوە؟ بەتەئکید نەخێر، چ جای ئاوی هەموو ئۆقیانووسەکان، ئێمەی مرۆڤیش ئەو عەقڵەی کە خوا پێیداوین، بەشی ئەوەندەیە بەندایەتیی پێ بۆ خوا بکەین و، پێی تاقی بکرێینەوە، بەڵام بەشی ئەوە ناکات نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی پێ بزانین، بۆیە خوا دەفەرموێ:

﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ﴿٥١﴾﴾ الكهف.

واتە: ئاگادارم نەکردوونەتەوە لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و لە دروستکردنی خۆشیان[٢]، چونکە هەندێ لە مولحیدەکان دەڵێن: بۆچی خوا منی دروست کردوە؟ بۆچی پرسی پێ نەدەکردم؟ ئاخر تۆ نەبی، چۆن پرست پێ بکات! پاشان تۆ بۆچی خۆت هێندە پێ گرنگە! تۆ زەڕڕەیەکی لە موڵکی خوا؟! من پێم وایە مرۆڤ کە خۆی لێ دەگۆڕێ، ئەو حاڵەتانەی بۆ دروست دەبن! پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ کە خاوەنی گەورەترین عەقڵ بوون، وەك چۆن خاوەنی بەرزترین ئەخلاقیش بوون و، خاوەنی پاکترین ڕووحیش بوون، بۆیە خوا کردوونی بە پێغەمبەر سەلامی خوایان لێبێ، هەرگیز ئەو جۆرە قسانەیان نەکردوون، ئنجا ئەوەی بەدوای پێغەمبەران بکەوێ، زۆر سەلامەت دەبێ، ئەگەرنا مرۆڤ بەدوای وەهم و خەیاڵ بکەوێ - کە کانگای وەسوەسەی شەیتانە - سەرگەردان دەبێ و سەری لێ تێك دەچێ.

---

(١) بڕوانە: ج١ ص٤٣٦-٤٣٨، هەروەها لە کتێبی (درء التعارض بين العقل والنقل)یشدا، هەمان ڕای هێناوەو تەبەننیی کردوە، بڕوانە: ج٢ ص٢.

(٢) واتایەکی دیکەی ئەوەیە: لەکاتی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و، دروستکردنی خۆیشیاندا ئامادەم نەکردبوون.
چونکە: (شهود) هەم بە مانای (رؤية) هەم بەمانای (حضور)ە، بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص ٤٦٥.

برگەی دووەم:

سەرەتای دروستکراوەکانی خوا بۆ ئێمە نەزانراوە، وەك کۆتاییان و، ئێمە جگەی لەوەی کە خوا سبحانە و تعالی بۆی باس کردووین، هیچی دیکەی لێ نازانین:

بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ﴿٥١﴾﴾ الكهف، ڕستەی: (مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ) دوو واتای هەن، وەك پێشتریش گوتمان:

١)- یانی: {مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ: ما أحضرتهم}، واتە: کاتێ ئاسمانەکان و زەویم دروست کردوون، ئەوانم ئامادە نەکردوە.

٢)- (مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ) یانی: نەمکردوون بە شاهێد، پرسیان پێ بکەم.

هەڵبەتە ئەوەش پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقە، تۆ کە نەبی، خوا چۆن پرست پێ بکات؟! ئنجا ئەو خەڵکە یەك بەیەك، پرسیان پێ بکرێ، شتێکی نامەنتیقییە.

گرنگ ئەوەیە ئێمە بزانین: سەرەتای درووستکراوەکان بۆ ئێمە نادیارە، تا ئێستا زانستیش لەو بارەوە بەهیچ نەگەیشتوە، ئەوەش کە دەگوترێ: سێزدە چواردە (١٣،١٤) ملیار ساڵ بەر لە ئێستا، تەقینەوە گەورەکە ڕوویداوە، ئەوە تەنیا بیردۆزەیەکەو، لەوەشدا ڕاجیایی زانایان زۆرەو هەمووشی هەر بە گۆترەو مەزەننەیە.

ئنجا خوا عز وجل دەربارەی ئەو کەسانە کە ئەو بیرۆکەیان لە مێشکدایە، دەفەرموێ:

﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾ الجاثية.

واتە: (مولحیدەكان) گوتیان: ژیان هەر ئەم ژیانی دنیایەمانە، دەژین و دەمرین و، جگە لە ڕۆژگار شتێكی دیكە، ئێمە نافەوتێنێ! (خوا دەفەرموێ:) لەو بارەوە هیچ زانیارییان نیە، تەنیا گومان دەبەن! بەڵێ هەرچی ئەو بیرۆكەو بیردۆزانەن كە لەگەڵ وەحییدا تێك دەگیرێن و، لەگەڵ ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییدا تێك دەگیرێن، بناغەیان تەنیا گومان و گریمانەو وەهم و خەیاڵە.

برگەی سێیەم:

دروستکراوەکان هەیانە بەرهەست و بینراوەو، هەشیانە نابەرهەست و نەبینراوو شێرراوەیە:

بەڵێ: مەرج نیە هەرچی هەبێ، بۆ ئێمە بەرهەست بێ و، لەڕێی پێنج هەستەکانەوە دەرکی بکەین: یان بیبینین، یان بیبیستین، یان تامی بکەین، یان بۆنی بکەین، یان دەستی لێ بدەین، خوا سبحانە و تعالی لە چەند شوێنێکدا، ئەو ڕاستییەش بەیان دەکات، بۆ نموونە:

﴿ فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الحاقة، واتە: یانی {وانیە} سوێند دەخۆم بەوەی کە دەیبینن و، بەوەش کە نایبینن.

ئەم (لا)یە بۆ نەفی سوێندەکە نیە، بەڵکو بۆ ڕەت دانەوەی قسەیەکە کە پێشتر کافرەکان کردوویانە، یان بەهۆی (سیاق)ەکەوە دەزانرێ.

(فلا) یانی: ئاوا نیە کە ئێوە دەیڵێن: سوێند دەخۆم بەوەی کە ئێوە دەیبینن و، بەوەش کە نایبینن.

وشەی (عالم الغیب والشهادة) خوا لەچەند شوێنان بەکاری هێناوە، کە (الغیب) پەنهانەو (الشهادة)ش ئاشکرایە، یاخود بینراوە.

شایانی گوتنە: ئەوەی کە کەسانێکی تووشی بیرۆکەی ئیلحاد کردوە، بەزۆریی ئەوەیە کە ویستوویانە: لەڕێگای پێنج هەستەکانەوە پەی بە بوونی خوا ببەن، ئەوەش بیرۆکەیەکی کۆنە، کاتی خۆی فیرعەون کە مووسا سەلامی خوای لێبێ، دەچێ بۆ لای و، ئیمان و تەوحیدی پێ ڕادەگەیەنێ، خوا ئاوا باسی هەڵوێستەکەی فیرعەون دەکات:

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰهَـٰمَـٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَـٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَـٰبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَـٰذِبًا ﴿٣٧﴾ ﴾ غافر.

واتە: فیرعەون گوتی: ئەی هامان! کۆشکێکم بۆ دروست بکە، بەڵکو بگەمە هۆکارەکان، هۆکارەکانی ئاسمانەکان، بچمە سەرێ تەماشای پەرستراوی مووسا بکەم، پێشم وایە درۆ دەکات {پەرستراوی مووسا بوونی نیە}.

گوتوویەتی: لەسەر زەوی من هەم و، دیارە پەروەردگاری مووسا لێرە نیە، با تەماشایەکی ئاسمانێش بکەم داخۆ لەوێ هەیە، پێشم وایە ڕاست ناکات!

بەڵام خوا لە وەڵامدا چی دەفەرموێ؟ ﴿ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ ﴾ غافر.

واتە: ئاوا فیرعەون پیلان و فێڵەکەی بۆ جوان کراو، لەڕێ لادرا، بەڵام فێڵ و پیلانی فیرعەون هەر ماڵ وێرانیی بوو، بێ ئەنجام بوو.

بۆچی خوا سبحانه و تعالی ناو لەو هەوڵەی فیرعەون دەنێ: پیلان و فێڵ (کید)؟! چونکە فیرعەون بەو هەوڵە چەواشەکارییەی ویستوویەتی: ئەو خەڵك و جەماوەرە هەڵخەڵەتێنێ، کە خەڵکینە! ئەوە خوا لەسەر زەوی نایبینین، بە پێنج هەستەکانمان نایبینین، ئنجا با بزانین داخۆ لە ئاسمانێ هەیە؟ هەتا هەندێ لە زانایان دەڵێن: کۆشکەکەشیان بۆ دروست کرد، قەڵاو منارەیەکی زۆر بەرز، تاکو بچێ تەماشا بکات، وەك چۆن ئەو فیرعەونانە هەرەمەکانیشیان دروست کردوون، هەر لە میصر، هەندێکیش دەڵێن: نا، ئەوە هەر بۆ چەواشە کردنی خەڵك بووە، هیچ قەڵاو بەرزاییان بۆ دروست کردوون[1].

---

(١) لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر ڕۆشنایی: زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا) بە درێژیی بیانووەکانی ئیلحادمان هەڵوەشاندوونەوە.

## برگەی چوارەم:

## خوا سبحانه و تعالى هەموو دروستكراوەكانی بە هەق دروست كردوون و، بەحیكمەت و تەرازوو:

زۆر كەس دەپرسێ: خوا ئەم بوون (وجود)ەی بۆچی دروست كردوە؟ حیكمەت لێی چییە؟ ئامانج لێی چییە؟ جارێك كە سەرەتای تەمەنم بوو، لە مەجلیسێكدا ئەو پرسیارەم لێ كرا گوتیان: ئەو بابەتە لە دوو حاڵەت بەدەر نیە:

١- یان خوا پێویستیی بە دروستكراوەكانیەتی.

٢- یان پێویستیی پێیان نیە.

ئەگەر پێویستیی پێیان نیە، بۆچی دروستی كردوون؟ دیارە: شتێكی بێ حیكمەت و هەوەنتەی كردوە!

ئەگەر پێویستیشی پێیانە، دیارە خوا موحتاجە!

وەڵامی پرسیارەكەم دایەوەو گوتم: نا، خوا پێویستیشی پێیان نیەو، بێ حیكمەتیش نیە كە دروستی كردوون، نموونەیەكم هێنایەوە، گوتم: كەسێكی خێرخواز بەلای لێقەوماوێكدا دەڕوات، دەست دەباتە گیرفان و هاوكارییەكی دەكات، هیچ پێویستیی بەو فەقیرە نیەو كارەكەشی كە كردوویەتی بێ حیكمەت نیە، چ شتێك پاڵی پێوە دەنێ؟ سیفەتی خێرخوازیی و میهرەبانیی خۆی، خوای پەروەردگاریش دروستكەرەو بەخشندەیەو بەبەزەییەو بەخشەرەو، بەپێی سیفەتەكانی خۆی، دروستكراوەكانی دروست كردوون، نەك لەبەر ئەوەی پێویستیی پێیانەو، هەروەها ئەوەش نیە كە پێویستی پێیان نیە، شتێكی بێ حیكمەتی كردبێ.

خوا عز وجل ئەم هەقیقەتەی لە زۆر شوێناندا دووبارە کردۆتەوە، بۆ نموونە:

١)- ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۢ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بەهەق هێناونە دی {هەقەکەش چییە؟} بۆ ئەوەی هەر نەفسێك سزاو پاداشت بدرێتەوەو ستەمیشیان لێ ناکرێ.

٢)- هەروەها لە سورەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا بَٰطِلٗاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ ص.

واتە: ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان بەگاڵتە بە بێ حیکمەت دروست نەکردوون، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، سزای سەخت لە ئاگر بۆ بێبڕوایان.

دوایی ڕوونی دەکاتەوە کە ناگونجێ ئەم گەردوونە بەبێ حیکمەت خوڵقابێ، دەفەرموێ:

ئایا دەگونجێ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، وەك خراپەکارانیان لێ بکەین، یاخود دەکرێ: پارێزکاران وەك تاوانباران مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین؟! واتە: ئەگەر دوارۆژ نەبێ و، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نەبێ، ئەوانە هەموویان یەکسان دەردەچن، ئەوەش پووچیی (عبپ)ێکە، لە خوا ناوەشێتەوە.

٣)- هەروەها لە سوورەتی (الروم) ئایەتی (٨)دا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾ الروم.

واتە: ئایا لە دڵی خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە {لەبەر خۆیانەوە ڕانەماون} کە خوا ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی نێوانیانی بەهەق نەبێ و، بۆ کاتێکی دیاریی کراو نەبێ، دروست نەکردوون، زۆرێك لە خەڵکیش بە دیداری خوا بێ بڕوان.

بەڕێزان! تەماشا بکەن! مولحیدترین زانای ئەو ڕۆژگارە بێنە دەڵێ: ئەم گەردوونە، وەك چۆن سەرەتایەکی هەیە - هیچ کەس نیە بڵێ: گەردوون سەرەتای نیە - بەهەمان شێوە کۆتاییشی هەیە، هەر زانستی فیزیا خەڵك ناچار دەکات، بڕوا بە کۆتایی پێهاتنی گەردوون بێنن، چونکە بەپێی یاسای دووەمی دینامیکی گەرمیی: کاتێك دێ ئەستێرەکان گەرمییان نامێنێ، یانی: ئەگەر خوای پەروەردگاریش لەبەینیان نەبات، هەر بۆخۆیان دەکوژێنەوە، هەندێك لەو ئەستێرانە کە تیشکیان دەگاتە ئێمە[1] بە ملیۆنێك ساڵ، هەیە بە پێنج سەد ملیۆن ساڵ، هەیە بە ملیارێك ساڵی تیشکیی، تیشکەکەی دەگاتە ئێمە، یانی: ئەو تیشکەی ئێستا ئێمە دەیبینین، هی ملیۆنێك، یان پێنج سەد (٥٠٠) ملیۆن، یان پازدە (١٥) ملیار ساڵ لەمەو پێشەو، ڕەنگە ئێستا هەر نەمابێ، ئەستێرەکانیش پیر دەبن، لەبەین دەچن و دەمرن، تاکو سەرەنجام گەردوون ئەو هەمووی دەپێچرێتەوە.

هەڵبەتە ژمارەی ئەستێرەکان (نجوم)یش زۆر زۆرە: بۆ وێنە ژمارەی ئەستێرەکانی کەهکەشانەکەی خۆمان کە ڕێی کێشان (دربُ التبّان) یان ڕێی شیریی (دَربُ اللّبَانة)ی پێ دەڵێن، نیزیکەی یەك تریلیۆن (١،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) ئەستێرەیەو، بە خێرایی (٣٠٠-٤٠٠)کم لە چرکەیەکدا بەرەو گەلە کەهکەشانی: ڕستە کچە (مجموعة مجرات العذراء) بەڕێوەیە!

ئنجا ژمارەی کەهکەشانەکانی گەردوونی بینراو، بە دووســەد ملیــار (٢٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) مەزەننە دەکرێ[2]و، هەندێکیش بەیەك تریلــیۆن (١٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠،٠٠٠) مەزنەنەی دەکەن.

---

(١) گەردووناسیی ئێستا تیرە (قُطر)ی گەردوونیان بە سێزدە - پازدە {١٣-١٥} ملیار ساڵی تیشکیی مەزەندە کردوە!

بڕوانە: (الکون بین القرآن والعلم) م. محمد عصام قصاب، ص ٥٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص٣٦.

بەڵێ ئەو دروستکراوانە هەموویان بەهەق هێنراونە دی، هەقەکەش بریتیە لەوەی کە مرۆڤ تاقی بکرێتەوە، ئنجا لێرەدا ئینسان بۆی دەردەکەوێ: مرۆڤ پێگەیەکی زۆر گەورەی هەیە.

٤)- لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سوورەتی (هود)دا، خوا هەموو گەردوون پەیوەست دەکاتەوە، بە تاقی کردنەوەی مرۆڤەوە، دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ هود.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بەشەش قۆناغ هێناونە دی و، بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقییتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەتان باشترە.. کەواتە هەموو ئەم گەردوونە، ئەو ئاسمان و زەوییە، ئاسمان و زەویی یانی: سەرو خواری دروستکراوەکان، بۆ تێدا تاقی کرانەوەی مرۆڤ هێنراونە دی، ئەوە ئەو هەقەیەو ئەو حیکمەتەیە کە خوا دروستکراوەکانی بۆ هێناونە دی.

ئەمە ئەوەیە کە بەلای ئێمەوە زانراوە، بەڵام ئایا خوا سبحانە و تعالى هیچ هەق و حیکمەتی دیکەی نیە؟ ئەدی ئەو هەموو فریشتانەی دروستکردوون، جیننی دروست کردوون، کە دیارە جیننییش وەك ئێمە لەتاقیکردنەوەدان، بەڵام ئایا خوا غەیری ئێمەو جینن و فریشتە، هیچ دروستکراوی دیکەی نین؟ هەڵبەتە ئەوانەی خوا لە قورئاندا باسی کردوون و ناوی هێناون، هەر ئەو سێیەن، بەڵام ئایا چیدیکە هەیە؟ چیدیکە نیە؟ هەر خوا دەیزانێ، ئێستا جار جار هەندێ هەواڵی زانستیی بڵاو دەبنەوە دەگوترێ: خڕۆکەیەکی دیکەیان دۆزیەوە، لەو بەینەی پێشوودا، ڕۆژنامەی (الشرق الأوسط) نووسیبووی: خڕۆکەیەکیان دۆزیوەتەوە، بەڵام (٥٠٠) ساڵ تیشکیی لە ئێمەوە دوورە، لەوانەیە ئەوێ ژیانی تێدا بێ، لەوانەیە ئاوی هەبێ، بەڵام (٥٠٠) ساڵ تیشکی لێمانەوە دوورە، یانی: لێرەوە ڕۆکێتێك هەڵدەی بە خێرایی تیشك بڕوا، کە سێ سەد هەزار

(٣٠٠،٠٠٠)کم لە چرکەیەکدا دەبڕێ، ئنجا دوای (٥٠٠) ساڵ دەگاتە وێ! کە ئەوە هەر خەیاڵەو لەوێش نازانن چ باسە! بەهەر حاڵ ئەوەی ئێمە بۆمان دەرکەوتوە، خوا لەم گەردوونەدا، بەس ئەم سەر زەوییەی وا هەڵخستوە، ژیانی تێدا بێ، ئەم ژیانەی سەر زەوییش وردەکاریی زۆری تێدا کراوە، ئەوجار وا هەڵخراوە کە مرۆڤی تێدا بژی، تاکو ئەو کاتەی خوا دەیەوێ.

برِگەی پێنجەم:

وەك چۆن دروستکراوەکان بە گشتی بە حیکمەت و بە هەق دروستکراون، ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ و جینن تاقی بکرێنەوە، هەر کام لە دروستکراوەکانیش بە حیکمەت و بە وردەکاریی و بەباشترین شێوە دروستکراون:

زانایانی کیمیاو فیزیاو زیندەوەرزان و ڕووەکناس و گەردووبناس، هەر کامیان لە بواری خۆیدا هیچ شتێك نیە بلێن: دەبووایە بەوجۆرە دروست نەکرابایەو، ئاوا بووایە، هەموو شتانەی کە دروست بوون، بە وردو درشتەوە، هەر زانایەك لە بواری پسپۆڕیی خۆیدا، کە لێی دەکۆڵێتەوە دەڵێ: خوای کارزان چۆنی داناوە، دەبووایە هەر بەو شێوەیە بێ و، هەر ئاوا دروستکرابووایە، بۆ وێنە:

١- دووریی مانگ لە زەوی، کە سێ سەدو چل هەزار (٣٤٠،٠٠٠)کم، تاکو سێ سەدو هەشتا هەزار (٣٨٠،٠٠٠)کم، دەبێ، دەڵێن: ئەگەر مانگ لە زەویی نزیکتر بووایە، هەڵکشان و داکشانی دەریاکان زیاتر دەبوو، لەجیاتی چەند مەترێك، چەند کیلۆ مەترێك دەبوو، بەڵام ئەگەر دوورتر بووایە، ئەو حاڵەتە بێهێز دەبوو، یان هەر نەدەبوو.

٢- ئنجا ئەو هێزی کێشندەیەی نێوان زەویی و مانگ، زانایان مەزەندەیان کردوە بە کێبلێکی پۆلایی کە تیرەکەی پەنجا (٥٠)کم بێت! ئنجا بەهۆی ئەو هێزەوەیە کە مانگ بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە، ئەدی ئەگەر مانگ نەبووایە، مانگ بەدەوری زەوییەوە نەبووایە! ئەوە هیچ هەڵکشان و داکشانی دەریاکان نەدەبووو، زۆر گۆڕانکاریی دیکەش دەبوون، یەکێ لە گۆڕانکارییەکان ئەوەیە کە زەوی لەجیاتی ئەوەی بیست و چوار (٢٤) سەعات جارێك بەدەوری خۆیدا بخولێتەوە، هەر چوار سەعات جارێك بەدەوری خۆیدا دەخولایەوە، یانی: تێکڕای شەوو

ڕۆژ یەکی دەبوونە دوو سەعات، دوو سەعات، ئنجا ئایا خەڵك بەفریای چی دەکەوت؟!

لەو بارەشەوە ئایەت زۆرن، بۆ نموونە:

١- لە سوورەتی (السجدة)دا، خوای بەرزو مەزن دەفەرمویٚ:

﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ﴾.

واتە: خوا هەر شتێکی دروست کردوە بەباشترین شێوە دروستی کردوەو دروستکردنی مرۆڤی لە قوڕیٚ وە دەست پێکرد.

٢- هەروەها خوای زاناو شارەزا لە سوڕەتی (النمل)دا دەفەرمویٚ:

﴿ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾.

واتە: ئەمە دروستکراوی خوایە، کە هەموو شتێکی بەباشترین شێوە هێناوتە دی، بە دڵنیایی ئەو شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن.

## بڕگەی شەشەم:

**خوا ئەم دروستکراوانەی هەموو هێناونە دی، بەمەبەستی ئەوە کە مرۆڤیان تێدا تاقی بکرێتەوەو، دوایی سزاو پاداشت بدرێتەوە:**

ئەم ڕاستییە بەلای کەمەوە لە سێ سووڕەتی قورئاندا باس کراوە: (هود، الكهف، الملك)، لە هەرسێکیاندا خوا دەفەرموێ: ئەم گەردوونە، ئەم زەوییە، ئەم ژیانە، هەڵخراوە تاکو مرۆڤی تێدا تاقی بکرێتەوە:

١- لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ هود.

واتە: ئەو (خوا) کەسێکە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژان (قۆناغان)دا هێناونە دی و، بارەگایەکەی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقییتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی چاکترە!

٢- لە سووڕەتی (کهف)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ الكهف.

واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە ڕازاندوومانەتەوە، تاکو تاقییان بکەینەوە کامیان کردەوەی باشترە.

٣- لە سووڕەتی (الملك)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ ﴿٢﴾ ﴾ الملك.

واتە: (خوا) ئەو کەسەیە کە مردن و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقییتان بکاتەوە: کامتان کردەوەی چاکترە.

ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە ئەم گەردوونە، ئێستا کە زانستی گەردووناسیی زۆر بەرەو پێش چووە، دەڵێ: ئەم زەوییەی ئێمە ئەوەندە بچووکە، دەنکە لمێك لەکەنار دەریایەك، لە چاو دەریایەکە چەندە، ئەو زەوییەی ئێمەش لەقەدەر گەردوون، ئەوەندەیە، ئنجا ئایا ئەم گەردوونە پان و پۆڕە، خوا بۆچی دروستی کردوە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: ئەوە یەکێکە لەو بابەتانەی کە لە عەقڵی ئێمەدا جێیان نابێتەوە، چونکە ئەوەی ئێمە دەیزانین: ئەو گەردوونە هەمووی پەیوەندیی هەیە بە ژیانی مرۆڤەوە، بەڵام ئایا تەنیا بە ژیانی مرۆڤەوە پەیوەستە؟! نازانین، بەڵام بەتەئکید بەپێی ئایەتی ژمارە (٧)ی سوورەتی (هود)و، ئایەتی ژمارە (١٣)ی (الجاثیة)ش کە دەفەرموێ:

﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ ١٣﴾ الجاثیة.

واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە (خوا) لەلایەن خۆیەوە بۆی ڕام و مەیسەر کردوون.

مانای وایە: هەموو گەردوون پەیوەستە بە ژیانی ئێمەوە، بەڵام ئایا بەس پەیوەستە بەژیانی ئێمەوە؟! ناتوانین بە جەزمیی بڵێین: بەڵێ.

برگەی حەوتەم:

ئەم دروستکراوانە هەموویان سەرەتایەکیان هەیە لەوێوە دەستیان پێ کردووە، کۆتاییەکیشیان هەیە، لەوێ کۆتاییان پێ دێ، بەڵام نە سەرەتایەکە تاکو ئێستا کەس دەیزانێ و، نە کۆتاییەکەش:

بۆ زانیارییتان! کۆتایی دروستکراوەکان پێی دەگوترێ (ساعة)، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: لێت دەپرسن: ئاخیر زەمان {کۆتایی ئەم ژیانە} کەیە؟ بڵێ: زانیاریی ئەوە لەلای پەروەردگارمە، خۆی نەبێ کەس دەری ناخات.

تەنانەت پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) کە جوبریل لێی دەپرسێ: {مَتَى السَّاعَةُ؟}: ئاخیر زەمان کەیە؟ وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ: {مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السَّائِلِ} أخرجه أحمد برقم (٩٤٩٧)، والبخاري برقم (٥٠)، ومسلم برقم (١٠)، وابن ماجه برقم (٤٠٤٤).

واتە: پرسیار لێکراو لەپرسیار کەر زانیاریی زیاتری لەبارەیەوە نیە.

## بڕگەی هەشتەم:

### پێنج ڕاستیی مەزن لەبارەی گەردوونەوە، لە قورئاندا:

### أ)- پێکهاتەکانی دروستکراوەکانی خوا، حەوت شتی سەرەکیین:

لە کۆتایی ئەم باسەدا ئاماژە بە پێنج ڕاستیی دەکەین، کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەیانی کردوون، دەربارەی دروستکراوەکان:

دوای سەرنج دان و تێوەڕامانی خۆم لە قورئان، پێم وایە پێکهاتە سەرەکییەکانی دروستکراو (خلـق)ی خوا، حەوت شتن:

١- (العرش) بارەگا، تەخت.

٢- (سدرة المنتهى) درەختی کۆتایی.

٣- (السماوات) ئاسمانەکان.

٤- (الأرض) زەوی.

٥- (ما بينهما) ئەوەی کە دەکەوێتە نێوان ئاسمانەکان و زەوی.

٦- (الجنّة) بەهەشت.

٧- (جهنم) دۆزەخ.

ئەمەش یەکی ئایەتێك لەبارەی هەر کامیانەوە، بەڕیزبەندیی هێنرانیان:

١- العرش: ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴿٧﴾ ﴾ هود.

٢- سدرة المنتهى: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾ النجم.

٣و٤و٥- السماوات والأرض وما بينهما: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ فِىٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّىۗ ﴿٨﴾ ﴾ الروم.

٦- الجنة: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ آل عمران.

٧- جهنّم: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ﴿٧١﴾ ﴾ الزمر.

بۆیەش دۆزەخم خستۆتە کۆتایی، چونکە وا پێدەچێ بەپێی ئایەتەکان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە عەرش بەرزترین دروستکراوی خوا بێ و، خوای پەروەردگاریش لەسەر عەرشە، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، ئنجا لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە (صلى الله عليه وسلم): {فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ، فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ، وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ، وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الجَنّة} أخرجه أحمد برقم (٨٤٥٥)، والبخاري برقم (٢٦٣٧) وابن حبان برقم (٤٦١١).

واتە: ئەگەر لەخوا پاڕانەوە، داوای فیردەوس بکەن، چونکە نێوەڕاست و بەرزترین جێگای بەهەشتەو، لە سەروویەوە عەرشی خوای خاوەن بەزەیی هەیەو، ڕووبارەکانی بەهەشتیش لەوێوە سەرچاوە دەگرن.

ئنجا ئەگەر عەرشی خوا لە سەرووەوە بێ و، فیردەوسیش کە بەرزترین شوێنی بەهەشتە، لەخوار عەرشی خواوە بێ، دیارە دوایی لە خوار وانەوە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، دێن.

ئنجا کە باسی دۆزەخ دەکرێ، وەك نزمترین و ژێرترین دروستکراوی خوا باس دەکرێ، بۆ وێنە: خوا لە سووڕەتی (المطففين)دا دەفەرموێ:

﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾.

واتە: نەخێر، ڕاست ناکەن {ئەی کافرەکان!} لیستی کردەوەی چاکەکاران لەسەری سەرەوەیە (عِلِّيِّينَ)، بەنسبەت خراپەکارانیشەوە دەفەرموێ:

﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ ﴾ المطففين، واتە: نەخێر {وا نیە کە دەڵێن، ئەی کافرەکان} لیستی کردەوەی تاوانباران لە (سجين)دایە.

تەفسیرەکان دەڵێن: {سجين: أي: أسفل الخلق}، واتە: ژێرترین دروستکراوەکانی خوا، ئنجا مادام (عليين) و (سجين) بەرانبەرو پێچەوانەی یەکدین دیارە: سەری سەرەوەو خواری خوارەوەو.

هەڵبەتە مەرج نیە ئەو هەقیقەتانەی لە قورئاندا بەیان کراون، گەردووناسیی و فیزیای ئێستا بیانزانێ و سەریان لێ دەربکات، یاخود بتوانێ قسەیان لێ بکات، چونکە ئەوەی ئێستا فیزیاو گەردووناسیی قسەی لێ دەکات، هەمووی تەنیا ئەوەیە کە بەدووربینەکان دەبینرێ، کە هەتا ئێستا ملیاران کەهکەشان دۆزراونەوە بەدووربینەکان، بەڵام خوا باسی حەوت ئاسمانەکان دەکات، ئنجا بەپێی ئەوە کە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ ﴿٥﴾ ﴾الملك، واتە: ئاسمانی نزیکمان بە چرایان ڕازاندۆتەوە.

کەواتە: هەرچی کەهکەشانە - کە ئەوانیش هەموویان لە ئەستێرەکان پێك هاتوون- هەموویان لە سنووری ئاسمانی یەکەم دان، ئنجا ئەو ئاسمانی یەکەمەش کەی تەواو دەبێ؟ هەر خوا دەزانێ، ئنجا لەسەرووی ئەوەوە: ئاسمانەکانی دیکە: دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەوتەم، هەن، ئنجا لە سەرووی ئەوانیشەوە: (سدرة المنتهى)، کە خوا دەفەرموێ بەهەشت لەلایەتی: ﴿ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾ النجم، ئنجا دوایی عەرشی خوای پەروەردگارو، ئەوەی کە خوا بۆخۆی دەزانێ چی دیکەی هێناوەتە دی! ئەوە هەقیقەتی یەکەم کە خوای پەنهانزان باسی کردوە، کە پێکهاتەی بوون (وجود)، ئەو حەوت شتە سەرەکییەن.

٢)- ئەو ماددەیەی کە خوا ئاسمانەکان و زەوی لێ دروست کردوون، بریتیە لە دووکەڵ (دُخان):

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾ فصلت.

واتە: دوایی (خوا) مەبەستی بەرەو (دروستکردنی) ئاسمان چوو، کە لەو کاتەدا دووکەڵ بوو.

کە ئێستا نوێترین بیردۆزەی فیزیاییش هەر وا دەڵێ و دەڵێ: گەردوون پێش ئەم حاڵەتەی لە شێوەی (گاز-غاز) دابوو، هەرچەندە ڕاستییەك کتێبی خوای زاناو شارەزا بیخاتە ڕوو پێویستی بە پشتڕاستکردنەوەی دیکە ناکات.

٣)- ئاسمانەکان و زەوی کاتی خۆی پێکەوە لکاو بوون، دوایی لێك کراونەوە:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان نازانن کە ئاسمانەکان و زەوی پێکەوە جۆشدراو بوون، لەیەکمان جیا کردنەوە، هەموو ژیاندارێکیشمان لە ئاوێ دروستکردوە، ئایا بڕوا ناهێنن؟!

٤)- خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، بە شەش قۆناغ هێناونیە دی:

خوای بەرزو مەزن لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ﴿٥٤﴾﴾ الأعراف.

کە لە حەوت شوێناندا خوای پەروەردگار ئەو حەقیقەتەی باس کردوە، بەڵام دەبێ زەینمان بۆ ئەوە نەچێ کە وشەی (یوم) بەو چەمك و واتایەی ئێستای بەکار هاتوە، لە زەینی ئێمەدا ڕۆژ (یوم) بیست و چوار (٢٤) سەعاتە، بەڵام هەندێ لە خڕۆکەکان ڕۆژەکەیان یەك هەزار (١٠٠٠) ساڵە، یانی: بە هەزار ساڵ ئنجا خولێك بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، کە دەبێـە هۆی دروست بوونی شەوگارو ڕۆژگار!

هەروەها خوا عز وجل باسی ئەوەی کردوە کە ڕۆژێك لەلای وی هێندەی هەزار (١٠٠٠) ساڵی لای ئێمەیە:

﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾ الحج.

کەواتە: (ستة أيام) شەش ڕۆژ، یانی: شەش قۆناغ، شەش ماوە لە کات.

٥)- خوا هەموو زیندەوەرەکانی لە ئاو دروست کردوون:

وەك خوا عـز وجـل دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴿٣٠﴾﴾ الأنبياء، واتە: هەرچی ژیاندارە (بەنسبەت سەرزەوی) لە ئاوێ وەدیمان هێناوە..

# باسی سێیەم

## مرۆڤ جێنشینی خوای بەرزە لەسەر زەوی

بەڕێزان!

خوا یار بێ لەشەش بڕگەدا بەکورتیی، بابەتی خەلیفەی خوا بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی دەتوێژینەوە:

هەڵبەتە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: دروست نیە وشەی جێنشینی خوا (خليفة الله) بۆ مرۆڤ بەکار بێ، لەبەر ئەوەی (خەلیفە) کەسێکە لە شوێنی کەسێك دادەنرێ و خواش شوێنی نیە.

هەندێکی دیکەش گوتوویانە: خەلیفە یانی: کەسێك کە لەشوێنی کەسێك کارێك دەکات، دیارە مرۆڤیش لەجیاتی خوا کار ناکات!

بەڵام - وەك پێشتریش باسمان کرد - ناگونجێ ئەم جۆرە قسانە، چەمك و واتای ئەو ئایەتانەیان پێ ڕەت بکەینەوە، خوای زاناو توانا زۆر بەڕوونیی دەفەرموێ: مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، بۆ وێنە:

١- ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴿٣٠﴾﴾ البقرة.

واتە: یاد بکەوە کاتێ پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمووی: دەمەوێ جێنشینێك لەسەر زەوی دابنێم {کە بێگومان مەبەست پێی ئادەمە سەلامی خوای لێبێ}

٢- هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ ﴿١٦٥﴾﴾ الأنعام.

واتە: ئەو (خوا) ئەو کەسەیە کە گێڕاونی بە جێنشینانی زەوی و، چەندان پلە هەندێکتانی بەسەر هەندێکتاندا بەرز کردۆتەوە....

## بڕگەی یەکەم:

### پێگەی مرۆڤ لە ئیعرابی دروستکراوەکاندا:

دەتوانین لە دە (١٠) خاڵاندا لە ڕوانگەی قورئانەوە، باسی پێگەی مرۆڤ بکەین:

**١- جێنشین بوونی مرۆڤ بۆ خوا لەسەر زەوی، مەبەست پێی ئەوەیە کە: خوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوەو دەستی کردۆتەوە، چی دەیەوێ بیکا:**

وەك پێشتر باسمان کردو ئەم دوو ئایەتەشمان بەبەڵگە هێناوەتەوە:

١- ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة.

٢- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾﴾ الأنعام.

ئنجا ئەوەش پێویستیی بەبەڵگەی نەقڵیی ناکات و، بەعەقڵ دیارە: مرۆڤ زەوی ئاوەدان دەکاتەوە، یان تێکی دەدا، خراپە دەکا، یان چاکە دەکا، ئەوە دیارە، خوای پەروەردگاریش تەدەخخول ناکاتە ژیانی مرۆڤ، بەو شێوەیە کە دەستی بگرێ، وەك ئەوەی فریشتان بنێرێ نەهێڵێ شەڕ بکەن و خراپە بکەن! بەڵکو لێیان گەڕاوە، چونکە بۆ تاقیکردنەوە لەسەر زەوی دایناون و، دەبێ دەستیشیان کراوە بێ.

**٢- ئینسان هەڵگری ئەمانەتی خوایە، ئەو ئەمانەتەی کە نە ئاسمان توانی هەڵی بگرێ، نە زەوی و نە چیایەکان.**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: ئێمە سپاردەمان بۆ ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان ڕانواند - کە هەڵیگرن - بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیگرن و لێی ترسان، کەچی مرۆڤ هەڵیگرت و ئەویش زۆر ستەمکارو نەفامە -ئەگەر بەبەرنامەی خواوە پابەند نەبێ-.

سپاردە (أمانة)ش زانایان زۆریان قسە لەبارەوە کردوە کە ئایا چییە؟ کورتەی ئەوەش کە پێم ڕاستە: ئەوەیە: کە ئینسان بە ویست (إرادة)ی ئازادانەی خۆی بژی، کە نە ئاسمان وایە، نەزەوی وایە، نە چیایەکان وان، بەڵکو هەموویان مەحکوومی کۆمەڵێك یاسان کە خوا بۆی داناون، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ چاك بکاو خراپ بکات و، بەرز بێ و نزم بێ.

**٣- مرۆڤ لە باشترین شێوەدا هێنراوەتە دی:**

وەك خوای تواناو زانا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ التين.

واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە چاکترین شێوەدا دروستکردوە.

**٤و٥- مرۆڤ لەلای خواوە ڕێزی لێگیراوەو، مرۆڤ لەلایەن خواوە هەڵبژێرراوە بەسەر زۆر لە دروستکراوەکانیدا:**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: بە دڵنیایی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتووە لە وشکانیی و دەریادا - بەهۆی ئامرازەکانی هاتوچۆو بارو سوارەوە - هەڵمانگرتوون و، لە بژێوە بە سوودو خۆشەکانمان بۆ ڕەحساندوون و، بەسەر زۆرێك لە دروستکراوانماندا هەڵمانبژاردوون.

**٦- ئادەم کە بابی مرۆڤانە، دوای ئەوەی خوا ناوەکانی فێر کردن، بەهەموو فریشتەکانی فەرموو: کڕنووشی بۆ بەرن، کڕنووشی ڕێزگرتن:**

وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە: یاد بکەوە کاتێك بە فریشتانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن یەکسەر هەموویان کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس، سەرپێچیی کردو خۆی بەزلگرت و لە بێبڕوایان بوو.

بەڵێ دوای ئەوەی خوا ئادەم دەکات بە مامۆستای فریشتان و، ناوەکانیان فێر دەکات، ئنجا پێیان دەفەرموێ: کڕنووشی بۆ بەرن.

**٧- خوای تاك و پاك، ڕووحی مرۆڤی پاڵ داوەتە لای خۆی:**

وەك فەرموویەتی: ﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴿٢٩﴾ ﴾ الحجر، واتە: لە ڕووحی خۆم فووم بەبەردا کرد....

هەندێ کەس بەنەزانیی وا دەزانن کە ڕووح لە خوا جیا بۆتەوە! نا، بەڵکو (مِن رُّوحِى) یانی: ئەو ڕووحەی بەتایبەتیی خوڵقاندوومە، جیا لە دروستکراوە ماددیی و بەرهەستەکان.

**٨- خوای پەروەردگار ئادەمی بە شێوەیەکی تایبەت دروستکردوە:**

کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَـٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ﴿٧٥﴾ ﴾ ص.

واتە: (خوا) فەرمووی: ئەوە ئیبلیس! چ شتێك ڕێی لێ گرتی: کڕنووش بەری بۆ کەسێك کە بەدوو دەستی خۆم دروستم کردوە؟!

کە مەبەست لێی دروست کردنێکی تایبەتە، جیا لە دروستکردنی گشتی دروستکراوەکانی دیکە.

**٩- خوا بە هەموو فریشتانی فەرموو: کە سەجدە بۆ ئادەم بەرن:**

وەك دەفەرموێ: ﴿ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الحجر.

واتە: یەکسەر فریشتەکان تێکڕاو وێکڕا سەجدەیان برد (بۆ ئادەم).

ئەمەش لێی دەفامرێتەوە کە فریشتەکان بە گشتی لە خزمەت مرۆڤاندان و هاوکاریانن.

**١٠- خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بۆ مرۆڤی دەستەمۆ کردوە، کە لێیان بەهرەمەند بێ:**

وەك خوا لە سووڕەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾.

واتە: (خوا) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، لەلایەن خۆیەوە بۆ ئێوەی ڕام و دەستەمۆ کردوە.

کەواتە: براو خوشکانی بەڕێز! کاتێك گوێمان لێ دەبێ کە ڕۆکێتێکیان هەڵداوە بەرەو مەرریخ و، ڕەنگە بۆ خڕۆکەکانی دیکەش هەڵی بدەن، نەك نابێ هیچ هەستیارییەکمان تێدا پەیدا بێ، بەڵکو دەبێ زۆریش دڵخۆش بین و بڵێین: سوپاس بۆ خوا: مرۆڤ گەیشتە ئەوەی سوود لە مەرریخیش ببینێ! چونکە خوا دەفەرموێ: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەم دەستەمۆ کردوە، کەواتە: عەجایب نیە زانستیی مرۆڤ زیاتر بەرەو پێشێ بچێ و، لە زۆر لە خڕۆکەکانی دیکەش بەهرەمەند بێ.

## بڕگەی دووەم:

### پێکهاتەی ئادەم و وەچەی ئادەم:

خوا سبحانه و تعالى باسی کردوە کە: هەم ئادەم و هەم وەچەی ئادەمیش لە دوو پێکهاتەی سەرەکیی دروست کردوون کە بریتین لە:

١- خاکی زەوی و ئاو، کە دەکاتە قوڕ، بۆ جەستەیان.
٢- ڕووحێك کە خوای بێ وێنە بە تایبەتیی دروستی کردوە.

وەك دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ الحجر.

واتە: یاد بکەوە کاتێك خوا بە فریشتانی فەرموو: من بەشەرێك لە قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆگەنی وشك بووەوە دروست دەکەم، ئنجا هەر کات جەستەکەیم ڕێکخست و لە ڕووحی خۆم فووم پێداکرد، یەکسەر بۆی بکەونە سەجدە.

بەڵێ مرۆڤ، هەم ئادەم و هەم حەوواش سەلامی خوایان لێبێ، هەم وەچەکەشیان هەموویان، دوو پێکهاتەی سەرەکییان هەن:

**یەکەم:** ڕووح کە جەوهەرو حەقیقەتی مرۆڤە.

**دووەم:** قاڵبێك کە بۆ ئەو ڕووحە دروستکراوە، هەر لە خاکی سەر زەوی و لەگەڵ ئاو تێکەڵ کراوە.

لەوانەیە یەکێ بڵێ: بۆچی لەشوێنێ دەفەرموێ: (تراب) و لەشوێنێ (طين) و، لەشوێنێ دەفەرموێ: (صلصال)؟

دەڵێین: مەبەست قۆناغەکانی دروست بوونی جەستەی مرۆڤە، هەر جارە باسی حاڵەتێك و قۆناغێکی کردوە، ئەگەرنا خوڵاصەی جەستەی مرۆڤ دەبێتەوە بە خاکی زەوی ئاوێتە لەگەڵ ئاو[1].



---

(١) لە تەفسیر کردنی ئایەتەکانی (١٠-٢٥)ی سەرەتای سوورەتی (الأعراف)دا، بە درێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردوە، بڕوانە: بەرگی شەشەمی تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز.

### برگەی سێیەم:

### مرۆڤ خاوەنی سروشتێکی دەگمەنە:

هەڵبەتە جینیش لەو سروشتە دەگمەنەدا لەگەڵیدا هاوبەشە، ئەویش بریتیە لەوە کە توانای خێرو شەڕیان هەیە، توانای بەرز بوون و نزم بوونیان هەیە، کە هیچ کام لە دروست کراوەکانی خوا وانین، نە دەتوانن لەو ئاستەی خوا بۆی داناون، بەرزتر بن، نە دەتوانن نزمتر بن، دڕندە هەر دڕندەیە، زیندەوەر هەر زیندەوەرە، فریشتە هەر فریشتەیە، ئەو ئاستەی کە خوا بۆی داناون، هەروان، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ بۆ چاکیی، بچێتە سەرووی فریشتانەوە، چونکە فریشتە خوا وای خوڵقاندوون سەرپێچیی لە فەرمانی خوا نەکەن، ئنجا مرۆڤ بەبەندایەتیی و فەرمانبەریی کردنی ئازادانەی بۆ خوا، دەتوانێ بچێتە سەرووی فریشتانەوەو، پێم وایە مرۆڤە خوا پەرستەکان بە گشتی، لە فریشتەکان بە گشتی، چاکترن و، پێغەمبەرانیش (علیهم السلام) لە فریشتە تایبەتەکان پایە بەرزترن، ئنجا بۆ خراپییش، مرۆڤ دەتوانێ بچێتە خوار دڕندانیشەوەو دەتوانێ زۆر زۆر نزم بێتەوە، بۆیەش خوا دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَـٰهُ أَسْفَلَ سَـٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾﴾ التين.

واتە: بە دڵنیایی مرۆڤمان لە باشترین شێوە پێکهاتەدا دروستکردوە، دوایی گێڕامانەوە خواری هەرێ خوارێ، بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، ئەوانە پاداشتێکی نەبڕاوەیان هەیە.

کەواتە: ئینسان بەهۆی ئیمان و کردەوە چاکەکانەوە، لەوە دەپارێزرێ، کە ئاوا نزم بێتەوە بۆ پلەی ژێری ژێرەوە.

## بڕگەی چوارەم:

## حیکمەت لە دروستکرانی مرۆڤ، بریتیە لەوە، کە تاقی بکرێتەوە:

وەك خوای کاربەجێ لە سوورەتی (الإنسان) ئایەتی (٢)دا دەفەرموێ:

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ۝٢﴾.

واتە: ئێمە ئینسانمان لە تنۆکە (نطفة)یەکی تێکەڵ دروستکردوە، تاقی دەکەینەوە، بۆیە بیسەرو بینەرمان کردوە.

بەڵێ، مرۆڤ بۆ ئەوە خوڵقاوە کە تاقی بکرێتەوە، ئنجا ئایا بۆچی خوا مرۆڤ تاقی دەکاتەوە؟ خوا هەر بۆخۆی دەزانێ و: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ۝٢٣﴾ الأنبياء.

واتە: خوا لەسەر ئەوەی دەیکات لێی ناپرسرێتەوەو، ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە.

بەڵام ئایا ئەو تاقیکردنەوەیەی مرۆڤ لەلایەن خواوە، هەقە؟ یان نا؟ بێگومان هەقە، چونکە خوا خاوەنی هەموو شتێکە: مرۆڤی دروستکردوە تاقی دەکاتەوەو، ئاژەڵی دروستکردوە بۆ خزمەتی مرۆڤ و، فریشتەی دروستکردون، کە تەنیا بەندایەتیی بۆ بکەن، خوای پەروەردگار خاوەنی گەردوونەو، گرنگ ئەوەیە خوا هیچ شتێکی بێجێی نەکردوە، ئینسان ئەگەر خوا بناسێ، هەرگیز ڕەخنەو گلەیی و پرتەو بۆڵەی لەدڵدا پەیدا نابێ بەرامبەر بەخوا، بەڵام کە خوای نەناسی، بە پێچەوانەوە، وەك جارێك لە ساڵانی هەشتایەکاندا لەگەڵ پیاوێکی مصریی لە شاری کەرکووك شەوێك لە هۆتێلێك بووم، دەیگوت: وەرە پێم بڵێ: خوا بۆچی ئێمەی دروستکردوە، من زۆر گلەییم لەخوا هەیە، پیاوێکی کرێکار بوو، دەیگوت: منی بۆچی بۆ ئەو بەدبەختییە دروستکردوە؟!

گوتم: من و تۆ زۆر لەوە بچووکترین ئەو ڕەخنەیە لەخوا بگرین، ئنجا جەنابت دەتوانی ئەو نارەحەتیی و ماندوبوونەو ئەو ڕەنج و میحنەتە بگۆڕی بۆ دیاریی (مِنحة) واتە: بەڵا بگۆڕی بە خەڵات.

گوتی: چۆن؟!

گوتم: کە شوکرانە بژێریی بکەی و عەبدی بۆ خوا صوڵحاوو چاك بی، خوای بەخشەر ئەو گرفتاریی و ماندوبوونەت لە دوا ڕۆژدا بۆ دەکاتە پاداشت، وێڕای ئەو ئۆخژن و ئاسوودەیی و ئارامیەی دڵ و دەروون، کە ژیانی دنیاشت بۆ وەك بەهەشت لێ دەکات! هەروەك بە پێچەوانەوە: دەشتوانی لە دنیاو دوارۆژدا بەو بیرۆکە خراپ و ڕەشبینانەیەت، خۆت بەدبەخت بکەی و هیچیش لە واقیعەکە ناگۆڕێ.

برگەی پێنجەم:

ئەرکی مرۆڤ لەم ژیانە سەرزەوییە کاتییەدا بریتیە لە: بەندایەتیی کردن بۆ خوا.

خوا تبارك و تعالی فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی خەڵکینە! بەندایەتیی ئەو پەروەردگارەتان بکەن، کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی هێناوەتە دی، بەڵکو پارێز بکەن (لە تووڕەیی و سزای خوا).

لێرەدا دەپرسین: ئایا خوا پێویستیی بەبەندایەتیی ئێمە هەیە؟ بە دڵنیایی نەخێر، ئەدی بۆچی خوا بەندایەتیی کردنی ئێمەی بۆ خۆی، لەسەر ئێمە پێویست کردوە؟!

بێگومان لەبەر ئەوەی خۆمان پێویستییمان بەبەندایەتیی هەیەو، ئێمە ئەگەر بەندەی خوا نەبین، دەبینە کۆیلەی دروستکراوەکان و زەلیل و زەبوون دەبین، بەڵام ئەگەر بەندەی خوا بین، ئازادو ئازا دەبین، سەربەرز دەبین، کێ لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ و شوێنکەوتووانیان سەربەرز تر بووە، ئازادترو ئازاتر بووە؟

بێگومان هیچ کەس، چونکە لە هەموو کەس زیاتر بەندەی خوا بوون، بەڵام فیرعەون و تاغووتێکی خۆسەپێن و سەروەت و ساماندار، پێش هەموو کەس زەلیل و زەبوونی ئارەزووو (هوی)ی خۆیەتی، یان زەبوون و بندەستی ئارەزووی دەست و پێوەندو دەورو بەرەکەیەتی، بەڵێ خوا عز وجل بۆیە بەندایەتیی کردنی ئێمەی بۆخۆی لەسەر ئێمە پێویست کردوە، چونکە خۆمان پێویستییمان بەو بەندایەتییە هەیە، تاکو هەم لە دنیادا سەربەرز بین و، هەم لەدوا ڕۆژدا سەرفراز بین، وەك فەرموویەتی:

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢﴾ المؤمنون.

واتە: بەڕشاستیی بڕواداران سەرفرازو بەختەوەرن، ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا - بۆ خوا - ملکەچ و خۆ پێ کەمن.

## بڕگەی شەشەم:

### بەسەرهاتی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی:

خوا سبحانه و تعالی له قورئاندا بەچەندان قۆناغ باسی سەرگوزشتەو بەسەرهاتی ژیانی مرۆڤی کردوە، کە ئێمە کردوومانەتە پازدە (١٥) قۆناغ[1]، بەمجۆرەی خوارێ:

### قۆناغەکانی ژیان و بەسەرهاتی مرۆڤ:

**یەکەم:**

**دروستکردنی خوای بەرز بۆ ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان، تاکو ببێتە شوێنی تێدا تاقی کرانەوەی مرۆڤ:**

وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ هود.

---

(١) پێشتریش باسمان کرد کە ئەم باسانە، پوختەو گوشراوی هەندێك لە باسەکانی مەوسووعەی: {الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}ن، ئەم باسەش لە: (الفصل الثالث)ی (الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق) وەرگیراوە.

دووەم:

ئاگادار کردنەوەی خوا بۆ فریشتەکان، کە دەیەوێ ئادەم و وەچەکەی لەسەر زەوی بکاتە جێنشینی خۆی و، پرسیار کردنی فریشتان لەبارەی حیکمەتی ئەو کارەوەو خستنە ڕووی حیکمەتەکەی لەوەدا کە ئادەم زانیارییەکی هەیە ئەوان نیانە:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلْأَسْمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِى بِأَسْمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَكَ لَا عِلْمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّىٓ أَعْلَمُ غَيْبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٣٣﴾﴾ البقرة.

سێیەم:

دروستکردنی خوای تاك بۆ ئادەم لە: گڵ، ئنجا قوڕ، ئنجا قوڕێکی ڕەش هەڵگەڕاو، ئنجا قوڕێکی وشك بووەی وەك گۆزە، دوایی ڕێکخستن و وێنە کێشانی جەستەکەی و، پاشان ڕووح بەبەر داکردنی:

وەك خوا فەرموویەتی:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾﴾ الحجر.

**چوارەم:**

**فەرمان کردنی خوا بە فریشتان کە کڕنووش -ی ڕێزگرتن- بۆ ئادەم ببەن پاش دەرکەوتنی ئیمتیازی زانستیی بەسەریانداو، جێبەجێ کردنی دەستبەجێی فەرمانی خوا لەلایەن فریشتانەوە:**

﴿ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ ص.

**پێنجەم:**

**سەرپێچیی کردنی ئیبلیسی نەفرین لێکراو لە فەرمانی خوا، بەهۆی خۆ بەزلگریی و حەسوودییەوە، بەرانبەر ئادەم:**

أ- ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾ الإسراء.

شەشەم:

نەفرین کردنی خوا لە ئیبلیس بەهۆی سەرپێچییەوەو، دەرکردنی لە بەهەشت و دابەزاندنی بۆ سەر زەوی:

أ- ﴿قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾﴾ الحجر.

ب- ﴿قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾﴾ الأعراف.

حەوتەم:

داوا کردنی ئیبلیس لە خوای بەرز کە هەتا ڕۆژی هەڵسانەوە، دەرفەتی ژیان و مانەوەی بدات و، هەڕەشە کردنی بە گومڕا کردنی ئادەم و وەچەکەی و، وەڵامدانەوەی خوا بۆ داواکارییەکەی، بەڵام تاکو کاتی دیارییکراو:

﴿قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾﴾ الحجر.

هەشتەم:

نیشتەجێ کردنی خوا بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی (حەووا) لە بەهەشتداو، بەهەشت بۆ ڕەوا کردنیان جگە لە درەختێك و، هۆشداریی پێدانیشیان کە وریای کەوتنە تەڵەو داوی شەیتانی دوژمنی سەرسەختیان بن:

أ- ﴿ وَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَـٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَـٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾ طه.

نۆیەم:

خوتخوتە کردنی ئیبلیس بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی و، بە درۆو دەلەسە هەڵخەڵەتاندنی بۆیان، کە ئەگەر لە درەختە قەدەغەکە بخۆن، زۆر قازانجیانە:

أ- ﴿ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَـٰنُ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ ﴾ طه.

ب- ﴿ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ لِيُبْدِىَ لَهُمَا مَا وُۥرِىَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَـٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَـٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّى لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّـٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ ﴾ الأعراف.

دەیەم:

فریو خواردنی ئادەم و ژنەکەی بە خوتخوتەی ئیبلیس و، خواردنیان لە درەختە قەدەغەکەو، دەرکەوتنی عەورەتیان بۆیان:

أ- ﴿ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ ﴾ الأعراف.

ب- ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأعراف.

یازدەیەم:

سەرزەنشتکردنی خوای دادگەر بۆ ئادەم و ژنەکەی (عليهما السلام) و بیر خستنەوەی هۆشداریی پێدانی بۆیان:

﴿ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ ﴾ الأعراف.

دوازدەم:

دانپێداهێنانی ئادەم و هاوسەرەکەی بەهەڵەکەیان و، داوای لێبوردن کردنیان و تۆبە لێ وەرگیرانیان لەلایەن خوای بەخشندەوە:

أ- ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الأعراف.

سێزدەیەم:

سزادانی خوای دادگەر بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی، بە دەرکردنیان لە بەهەشت و دابەزاندنیان بۆ سەر زەوی:

أ- ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيْطَـٰنُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٣٦﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَـٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأعراف.

چواردەیەم:

بە ڵێندانی خوا بە جندو مرۆڤ، کە وەحیی و ڕێنماییان بۆ دابەزێنێ و، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە سەرەنجامی چاك لە گرەوی خوا پەرستانی فەرمانبەر (مطيع) دایەو، ئاکامی خراپ و شوومیش، یەخەی لادەران و سەرپێچییکاران دەگرێ:

أ- ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَـٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ

أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِـَٔايَـٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْـَٔاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ ﴾ طه.

پازدەیەم:

جێبەجێ کردنی خوا بۆ بەڵێنەکەی بە ناردنی پێغەمبەرانی و دابەزاندنی کتێب و بەرنامەکانی:

أ- ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء.

ب- ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَنزَلْنَا ٱلْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَـٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ ﴾ الحديد.

ج- ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ ﴾ إبراهيم.

د- ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ فاطر.

پوختکردنەوەی ئەم پازدە قۆناغەی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی:

خوای پەروەردگار مرۆڤی وەك جێنشینی خۆی و هەڵگری سپاردەکەی، لەسەر زەوی دانا، ئەویش دوای ئەوەی کە ئادەمی دروستکرد، ئنجا بە فریشتەکانی فەرموو: کڕنووشی بۆ ببەن، واتە: ڕێزی لێ بگرن، چونکە بەپێی حیکمەتی خوا، مرۆڤ لە ئەصڵدا بۆ سەرزەوی دروستکرابوو، بەڵام وەك قۆناغێکی ڕاگوزەر (مرحلة انتقالية)و بەمەبەستی تاقیکردنەوەی لەبەهەشتدا داندرابوو، هەڵبەتە هەندێ لە زانایانیش دەڵێن: ئەو بەهەشتە باغێك بووە لەسەر

زەوی، بەڵام ئەو ڕایەم پێ بێهێزە[١]، پێم وایە هەر لە ئاسمان بووە، ئیبلیسیش هەر لەوێ بووە، ئنجا ئایا ئیبلیس بۆچی لەوێ بوو؟ چونکە بەندەیەکی زۆر بۆ خوا صوڵحاو بوو، لە ڕیزی فریشتەکان دابوو، بەڵێ: ئیبلیس جیابوو لە فریشتان و، لە جندان و بوو، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿كَانَ مِنَ ٱلۡجِنِّ فَفَسَقَ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِۦٓ ۝٥٠﴾ الكهف.

واتە: ئیبلیس لە جینن بوو، بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو.

(جن)یش لە ئاگر دروستکراون: ﴿وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ۝١٥﴾ الرحمن،

واتە: (خوا) جیننی لە بڵێسەی ئاگر دروستکرد.

بەڵام لەڕووی بەندایەتییەوە، هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئیبلیس سەرۆکی مەلائیکەتەکان بووە.

ئنجا ئیبلیس کە سەجدەی ڕێزگرتن بۆ ئادەم نابات، نەفرینی لێ دەکرێ و لەبەهەشت دەردەکرێ، دواییش ئادەم لەگەڵ حەووا سەلامی خوایان لێبێ کە لە تاقیکردنەوەی خوادا دەکەون، کە درەختێکیان لێ قەدەغە دەکات و ئەو بەهەشتە پان و پۆڕەیان هەموو بۆ حەڵاڵ دەکات، جگە لەیەك درەخت، دەفەرموێ: لێی مەخۆن! بەڵام بەهەر حاڵ لەو درەختە دەخۆن و، سەرەنجام دوایی عەیب و عارو عەورەتی خۆیانیان بۆ دەردەکەوێ و، خوای دادگەریش سزایان دەدات و لەسەر زەوی دایان دەنێ، ئیدی لەوێوە ژیانی بەشەر دەست پێ دەکات.

---

(١) لە تەفسیری سووڕەتی (الأعراف) ئایەتەکانی: (١٠-٢٥)دا، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێبێ و ئیبلیسمان کردوە، بەڵگەکانی سەلماندنی ئەو ڕایەشمان خستووونە ڕوو کە دەڵێ: شوێنی تێدا تاقی کرانەوەی ئادەم و حەووا هەر (باغی بەهەشت) بووە، کە بۆ بڕواداران دانراوە، نەك باغێکی دیکەی سەر زەوی.

هەر چەندە هەرچۆن بێ ئەو شوێنە - چ لەسەر زەوی بووبێ چ لە ئاسمان - هەر تاقیگایەك و شوێنێکی ڕاگوزەر (إنتقالي) بووە، وەك شوێنێکی مەشق و ڕاهێنان بووە.

کەواتە: بەهۆی گوناهێکەوە بەشەر تووشی ژیانی سەر زەوی بوو، یانی: ئێمە بەهۆی گوناهەوە شۆڕ بووینەوە، خوای پەنهانزان دەفەرموێ:

﴿ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢا ﴿١٢٣﴾ ﴾ طه.

واتە: لێی دابەزنە خوار، شۆڕبنەوە، ئنجا ئایا جارێکیدیکە بەچی بەرز دەبینەوە؟! بێگومان بەهۆی تاعەتەوە، خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ ﴿١٠﴾ ﴾ فاطر.

واتە: وشەی پاك و چاك {خوا بەیەکگرتن (توحید)} بەرەو لای وی {بۆ لای خوا} بەرز دەبێتەوەو، کردەوەی چاك بلْندی دەکات {یانی: وشەی خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستن، بەهۆی کردەوەی باشەوە بەرز دەبێتەوەو خوا وەری دەگرێ}.

خوا بەلوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەهۆی تاعەت و دینداریی و بۆ خوا صولْحانەوە، شایستەی ئەوە دەبین، جارێکی دیکە بەرز بینەوەو، بچینەوە بەهەشتەکەی خوای پەروەردگارو بەخشندەوە.



# باسی چوارەم

## ژیانی دنیا جێی تاقیکردنەوەیەو، ژیانی دوارۆژ شوێنی مانەوەیە

بەڕێزان!

خوا پشتیوان بێ لە حەوت بڕگەدا بە کورتیی و پوختیی باسی ئەم بابەتە دەکەین، ئایا ژیانی دنیاو ژیانی دوارۆژ، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، چۆن تەماشا دەکرێن و، هەڵدەسەنگێنرێن؟!

### بڕگەی یەکەم:

#### ژیانی دنیا قۆناغی تاقیکرانەوەیە بۆ مرۆڤ و جینن:

وشەی دنیا (مؤنث)ی (أدنی)یە، کەواتە: (الحیاة الدنیا) یانی: (الحیاة الأقرب)، ئەو ژیانەی کە نزیکترە، لەپێشترە.

ڕۆژی دواییش پێی دەگوترێ: (الدار الآخرة)، یانی: مەنزڵگای دواتر، یانی: دواترو دەیگەینێ، بەڵام (الحیاة الدنیا) یانی: ژیانی نزیکتر لە ئێمە، کە

ئەم ژیانەیە ئێستا تێیدا دەژین، ئنجا ئەوە کە ژیانی دنیا قۆناغی تاقیکرانەوەیە بۆ مرۆڤ و جینن، لەزۆر ئایەتی قورئاندا بەیان کراوە، بۆ وێنە:

١- خوا تبارك وتعالى لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتەکانی (٢٤و٢٥)دا، دەفەرموێ:

﴿ قَالَ ٱهْبِطُواْ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ ﴾.

واتە: (خوا) فەرمووی: دابەزن، (لەئاسمان، لەبەهەشت) {کێ دابەزێ؟ ئادەم و حەووا سەلامی خوایان لێبێ، باب و دایکی مرۆڤایەتیی، هەروەها ئیبلیسیش، ئیبلیس باسی هاوسەری نەکراوە، بەڵام بەتەئکید ئەویش دیارە خوای زاناو توانا هاوسەری بۆ خوڵقاندوە، ئەوانیش (جینن) وەك مرۆڤ نێرو مێیان هەیەو، وەچەیان هەیە} هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن {کێ، دوژمنی کێیە؟ بەتەئکید ئیبلیس دوژمنی ئەوانە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴿٦﴾ ﴾ فاطر.

واتە: بێگومان شەیتان بۆ ئێوە دوژمنە، ئێوەش دوژمنایەتیی بکەن، یانی ئەو دەستپێشخەری دوژمنایەتییەکە بووەو ئێوەش دەبێ بەچاوی دوژمن تەماشای بکەن}و نشینگەیەك لەسەر زەوی هەیە بۆ ئێوە، هەروەها هۆکارەکانی ڕابواردن و گوزەراندن، تاکو کاتێکی دیارییکراو، هەر لەوێدا دەژین و لەوێشدا دەمرن و، لەوێش جارێکی دیکە دەردەهێنرێنەوە.

بۆیە هەرچی کە باس دەکرێ و دەگوترێ: بەتەمان لەسەرمانگ یان مەرریخ چی و چی دابنێن! هەمووی خەون و خەیاڵە، بەڵێ دەگونجێ مرۆڤێك بچێتە سەر مانگ و لەوێش بمرێ، بەڵام ئەوە کە خەڵك لەوێ بژیەت! نەخێر، خوا ژیانی مرۆڤی لەم سەر زەوییە داناوە، ئەوەی کە دەچێ بۆ سەر مانگ، بە پلە پڕووزە ئەوەندە ئۆکسجینەی لەگەڵ خۆی بردوە، پێش ئەوەی ببڕێ و دەبێ بەشی گەڕانەوەشی بکات، بەپەلە دەگەڕێتەوە! کەواتە: تەنیا ئەم زەوییە شوێنی ئەم ژیانی دنیایە بۆ ئێمەو، بۆ جیننیش و شوێنی تاقیکرانەوەیە، بۆ هەردووك لایان.

٢- خوا عز وجل لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی (١٣٠)دا، دەفەرموێ:

﴿ يَـٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ١٣٠ ﴾.

واتە: ئەی کۆمەڵی جینن و مرۆڤـ! ئایا لەخۆتان ڕەوانە کراوانێکتان بۆ نەهاتن، ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوەو، لەم دیداری ئەمڕۆتان ئاگاداریان دەکردنەوە؟! گوتیان: شاهێدییمان لەسەر خۆمان داو، ژیانی دنیاش فریوی دان و، شاهێدییان لەسەر خۆیاندا، کە بێبڕوا بوون.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا وەك چۆن لەنێو مرۆڤاندا پێغەمبەران، سەلامی خوایان لێبێ هاتوون، لەنێو جینیشدا هاتوون؟ چونکە کە خوا لێرە دەفەرموێ: (أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ) لە وەڵامدا دەڵێین: هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن و ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواش هەر ئەوە دەگەیەنن، کە پێغەمبەران بەس لە مرۆڤـان بوون، بەڵام ئایا بۆچی دەفەرموێ: (مِّنكُمۡ)؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: چونکە جینن لەگەڵ مرۆڤـدا لەسەر زەویین.

ئنجا ئەوەندەی بۆم دەرکەوتوە، چ لەڕێی تایبەتیی خۆمەوە، چ لەڕێی خوێندنەوەو بەدواداچوونەوە، جند، جینن (جن) زۆر لەژێر کاریگەریی مرۆڤدان، کافرەکانیان شوێن کافرەکان دەکەون و، مسوڵمانەکانیشیان شوێن مسوڵمانەکان دەکەون، واش پێدەچێ (جند)، قۆناغێك لەخوار مرۆڤەوە بن، بۆیە شایستە نەبوون پێغەمبەرانیان لەنێودا بێن، ئنجا پێم وایە جند لەسەرووی ئاژەڵەوەن و، لەخوارەوەی مرۆڤن، چونکە ئەوان سوود دەبینن لەو خواردنانەی ئێمە فڕێیان دەدەین، وەك لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە[1]!

---

(١) صحيح مسلم: ٦٠٥، ٦٠٦، هەروەها مغني المحتاج، ج١ ص ٨٢، ط٢٠١٦، دار المترجم.

ئنجا ئەوانیش پابەند كراون بەوەی شوێن پێغەمبەرانێك بكەون، كە لە سەردەمەكاندا هاتوون، نەك هەر ئەوەندەش بەڵكو ئێستا هەر بانگخوازێك، مامۆستایەك، كەسێك كە دەرس دەڵێتەوە، یان وتار دەدا، بەپێی ئەوەی بۆم دەركەوتوە: جندە مسوڵمانەكانیش دێن بەهرە وەردەگرن و لەمرۆڤانەوە فێر دەبن، بۆیە كاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وتاری داوە، جندی مسوڵمانیش گوێیان لێ گرتوە، بەڵێ چەند فەرمایشتێكی دەگمەن هەن، كە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەتایبەت چووبێ قسەی بۆ جند كردبێ، بەڵام بەزۆریی ئەوانیش لەگەڵ مرۆڤەكاندا گوێدەگرن، بێ ئەوەی كە بیانبینین، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ﴿٢٧﴾﴾ الأعراف.

واتە: خۆی و كۆمەڵەكەی دەتانبینن، بێ ئەوەی ئێوە بیانبینن[1].



---

(١) لە (الكتاب الرابع)ي {موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}دا بە ناوونیشانی: (الإيمان بملائكة الله وبالجن)دا، بەدرێژیی باسی فریشتەو جندمان كردوە.

برگەی دووەم:

ژیانی دنیا لە ڕووی تێدا ڕابواردنی و خۆشییەکانی و، لە ڕووی تێدا مانەوەی و، بەبەراورد لەگەڵ ژیانی ڕۆژی دواییدا، شتێکی زۆر بچووکەو وەك گەمەی منداڵان وایە:

ئەم هەقیقەتانە زۆر گرنگن ئێمە بیانزانین، چونکە هەندێ لە مامۆستایان، جاری وا هەیە ئەو هەقیقەتانەیان لێ تێکەڵ دەبن، خوای کارزان دەفەرموێ:

﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ ﴿٢٠﴾ ﴾ الحديد.

واتە: بزانن کە ژیانی دنیا تەنیا گەمەیەو، خافڵانەو، جوانییەو، خۆ بەسەریەکدا هەڵکیشانەو، زۆر کردنی سامان و منداڵانە، وەك بارانێك کە جووتیاران ئەو ڕووەکەی پێی دەڕوێ، سەرسامیان دەکات دوایی سەوز دەبێ و دەگاتە هەڕەتی خۆی و دوایی دەبێتە پووش و پەڵاش { و با ڕای دەماڵێ}.

ئنجا ئایا لێرەدا خوا کە ئاوا باسی ژیانی دنیا دەکات و، لە چەند شوێنی دیکەدا کە دەفەرموێ: ژیانی دنیا کەمە، گەمەیە، یارییە، خافڵانە، مەبەستی پێ چییە؟

بێگومان مەبەستی پێ لایەنە ماددییەکەیەتی، لایەنە ماددییەکەی ژیانی دنیا چییە؟ وەك گەمەی منداڵانە، منداڵ خانووچکەیەك دروست دەکات یان شتێك یاریی پێ دەکات، دوایی فڕێی دەدا، تەنیا کاتێکی دیارییکراوی لەگەڵ دەباتە سەرو پێی دەخافڵێ.

ژیانی دنیای ئێمەش ئاوایە، لە ڕووە ماددییەکەیەوەو بەبەراورد لەگەڵ نازو نیعمەتی بەهەشتدا، خوا دەفەرموێ: شتێکی کەم بایەخەو بچووکە، ئەگەرنا وەك لە بڕگەی سێیەمدا باس دەکەین، لەو ڕووەوە کە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیەو، شوێنی جێ نشینایەتیی تێدا کردنی خوایەو، شوێنی هەڵگرتنی ئەمانەتی خواو، هەڵسانە بەبەندایەتیی کردن بۆ خوا، زۆر زۆر گرنگەو پێگەو پایەیەکی زۆر گەورەی هەیە.



برگەی سێیەم:

ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە جێی تێدا تاقیکرانەوەو جێنشینایەتیی کردنی خوایە، پێگەیەکی یەکجار مەزن و هەستیاری هەیە:

١- خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ ٱلۡأَرۡضِ وَرَفَعَ بَعۡضَكُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمُۢ ١٦٥﴾ الأنعام.

واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی کردۆتە جێنشین لەسەر زەوی و هەندێکتانی بەسەر هەندێکتاندا بەرز کردۆتەوە، {کەسێك عەقڵی زیاتری پێداوە، کەسێك لەڕووی جەستەوە بەهێزترە، کەسێك لەڕووی ماڵ و سامانەوە باڵایە...هتد خوای پەروەردگار هەندێ شتی بە هەندێ کەس داوە، زیاتر لە هەندێ کەس، بۆچی؟؟}.

(لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡ) بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەوەدا کە پێیداون، بێگومان پەروەردگارت تۆڵەی خێرایەو، زۆریش لێبوردەی بەبەزەییە.

٢- هەروەها خوا عز وجل لە سووڕەتی (یونس) ئایەتەکانی (١٣و١٤)دا دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ١٣ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ١٤﴾ یونس،

واتە: لەپێش ئێوەدا گەلێك سەدەمان فەوتاندن و، پێغەمبەرانیان هاتنە لایان بەبەڵگە ئاشکرایەکانەوە، بەڵام نەدەگونجا ئیمان بێنن {لەبەر ئەوەی ئەوەندە بە زوڵم و خراپە چووبوونە خوار، ڕێی ئیمان هێنانیان لەخۆیان گرتبوو} ئاوا سزای

تاوانباران دەدەین، دوایی ئێوەمان کردە جێنشینی ئەوان لەسەر زەوی، تاکو بزانین چی دەکەن؟

ئنجا بەرێزان با تەماشا بکەین! خوا بەدەقی ئایەت دەفەرمویٚ: ئێوەمان کردۆتە جێنشینی گەلە پێشووەکان لەسەر زەوی، بۆ ئەوەی تەماشا بکەین: چی دەکەن؟ یانی: خوا ئێستا تەماشامان دەکات، فریشتەکان تەماشامان دەکەن، هەموو هەڵس و کەوتمان تۆمار دەکریٚ، کە بێگومان ئەوە زۆر گرنگ و هەستیارو گەورەیە، بەڵیٚ ژیانی دنیا لەو ڕووەوە کە شوێنی تێدا تاقی کرانەوەیە، شوێنی بەندایەتیی بۆ خوا کردنە، شوێنی جێنشینایەتیی خوا کردنە، شوێنی تێدا هەڵگرتنی ئەمانەتی خوایە، زۆر زۆر گەورەیە، چارەنووسی مرۆڤی هەتا هەتایی بەم ژیانی دنیایەوە بەستراوە، کەواتە: کە دەفەرمویٚ: ژیانی دنیا یاریی و گاڵتەو گەپە، یانی: لەڕووە ماددییەکەیەوە، لێتان تێك نەچیٚ!

کەواتە: کە هەندیٚ لە مامۆستایان بە ڕەهایی دەڵێن: ژیانی دنیا هیچ نیە! چۆن هیچ نیە؟ ئەدی ئەگەر هیچ نەبیٚ، خوا سەدو بیست و چوار هەزار (١٢٤،٠٠٠) پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبیٚ، دەنێریٚ؟! وەك لە (المسند)ی ئەحمەددا ڕەحمەتی خوای لێبیٚ، هاتوە[1]، ئایا ئەو هەموو کتێبانە دادەبەزێنیٚ؟! بەڵیٚ ئەوە زۆر گرنگە، تەماشای قورئان بکەن! (٦٢٣٦) ئایەت لە (١١٤) سوورەتدا، خوا ئەو هەموو فەرمایشتەی کردوە، ئنجا ئەوە بەس لە قورئاندا، پاشان تەورات و ئینجیل و زەبوورو صوحوف و کتێبەکانی دیکە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: (١٠٤) کتێب بوون[2]، کتێبی سەربەخۆ، ئەگەرنا هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، پەیامی بۆ نەهاتبیٚ.

---

(١) کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: {عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قال: أبو ذر: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ! كَمْ وَفَّى عِدَّةُ الْأَنْبِيَاءِ؟ قَالَ مِائَةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَةٌ وَعِشْرُونَ أَلْفًا، الرُّسُلُ مِنْ ذَلِكَ ثَلَاثُ مِائَةٍ وَخَمْسَةَ عَشَرَ جَمًّا غَفِيرًا} أخرجه أحمد برقم (٢٢٣٤٢)، والطبراني برقم (٧٨٧١)، قال الهيثمي (٢١٠/٨): رجاله رجال الصحيح غير أحمد بن خليد الحلبي، وهو ثقة، والحاكم برقم (٣٠٣٩)، وقال: صحيح على شرط مسلم، وصححه الألباني.

(٢) کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: {عن أبي ذر الغفاري أنه سأل النبي (صلى الله عليه وسلم): كم كتاباً أنزله الله؟ قال: مائة كتاب وأربعة كُتُب} أخرجه ابن حبان برقم: (٣٦١).

کەواتە: دەبێ بزانین ژیانی دنیا لەڕووە ماددییەکەوەیەو بەبەراورد لەگەڵ دوا ڕۆژدا، شتێکی کەم و کەم بایەخە، ئەگەرنا لەو ڕووەوە کە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، زۆر گەورەو گرنگەو، زۆر جێگای مەترسییە، کە ئینسان نەزانێ چۆنی دەگوزەرێنێ! وەك یەکێ لە شاعیرەکان دەڵێ:

لقد خلقت لأمر عظيم لو فطنت له       فاربأ بنفسك أن ترعى مع الهمل

واتە: بۆ شتێکی زۆر مەزن خوڵقاوی، ئەگەر عەقڵت پێی بشکێ، لەخۆتی مەوەشێنەوەو، بەخۆتی ڕەوا مەبینە، کە لەگەڵ ئاژەڵان بلەوەڕێی.

دیارە کە ئاژەڵ دەلەوەڕێ، ئێمەش خواردن دەخۆین، بەڵام لەگەڵ ئاژەڵ لەوەڕان، یانی: ئێوە ژیانەکەتان بەس ببێ بە خواردن و خواردنەوەو ئەو شتانە کە پەیوەندییان بە جەستەتانەوە هەیە، وەك خوا دەربارەی کافرەکان دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوًى لَّهُمۡ ١٢﴾ محمد.

واتە: ئەوانەی بێ بڕوان، دەخۆن و ڕادەبوێرن، وەك چۆن ئاژەڵ دەخواو ڕادەبوێرێ و، جێگاو سەرەنجامیشیان ئاگرە.

واتە: با ژیانەکەتان لە خزمەتی جەستەتاندا کورت هەڵنەیەت، ئەگەرنا بەتەئکید جەستەشمان هەقی لەسەرمانە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {فإنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيْكَ حقاً...} أخرجه البخاري برقم: (١٩٧٥).

برگەی چوارەم:

بەهرەمەند بوون لە خۆشییەکانی ژیانی دنیا بەبێ زێدەڕۆیی، نەك هەر خوا قەدەغەی نەکردوە، بەڵکو بە ئەندازەی پێویست واجبیشی کردوە:

ئایەتی قورئان لەو بارەوە زۆرن بۆ نموونە:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١﴾ الأعراف.

ئەی وەچەی ئادەم! لەلای هەر مزگەوتێك خۆتان بڕازێننەوە، {ئنجا ئەگەر لە مزگەوتێ خۆت بڕازێنیەوە، دەبێ لەبازاڕو مەجلیس و.. هتددا باشتر} هەروەها بخۆن و بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی نەکەن، بێگومان خوا زێدەڕۆیانی خۆش ناوێن.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨﴾ البقرة.

واتە: ئەی خەڵکینە! لەوەی کە لەزەوییدا هەیە، لە شتە خۆش و پاك و چاکەکان بخۆن، بەڵام شوێن هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، بێگومان ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە.

کەواتە: لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: لەززەت وەرگرتن و بەهرەمەند بوون لەنازو نیعمەتەکانی خوا، کە لە زەوییدا دایناون، لە ژیانی دنیادا، نەك هەر قەدەغە نیە، بەڵکو کەسێك هەقی جەستەی خۆی نەداو خزمەتی جەستەی خۆی نەکا، بەبەهرە وەرگرتن لە نیعمەتەکانی خوا، گوناهباریش دەبێ، بۆیە زانایان دەڵێن: ئەگەر کەسێك بە بیانووی دنیا بەکەمگرتن و لەخوا نزیك بوونەوەو تاعەت

زۆر بۆ خوا ئەنجامدانەوە، زیان بە جەستەی خۆی بگەیەنێ، گوناهبار دەبێ، لەجیاتی ئەوەی کە پاداشتی ببێ، بەڵکو خوا فەرموویەتی: تەنانەت ئەو چوار شتەش کە لە چوار ئایەتی قورئاندا دەفەرموێ قەدەغەن:

١- مردارەوەبوو.

٢- خوێن.

٣- گۆشتی بەراز.

٤- بۆ غەیری خوا سەربڕاو.

دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۚ ﴿١٧٣﴾﴾ البقرة.

واتە: هەر کەسێك تێگیراو ناچار بوو، بەبێ ئەوەی کە مەبەستی بێ لەو شتانە بخوات و، بەبێ ئەوەش کە لە سنووری پێویست، تێپەڕێنێ، ئەوە بە لێخواردنی ئەو چوارەش، گوناهبار نابێ! بەڵکو زانایان دەڵێن: ئەگەر لێیان نەخوات، گوناهبار دەبێ، واتە: ئەگەر لەبرسان بمرێ و لەو چوار قەدەغە کراوە نەخوات، کە لەئەصڵدا حەڕامن، ئەوە ئۆباڵی مردنەکەی خۆی، دەکەوێتە ئەستۆی.

## بڕگەی پێنجەم:

### خوای پەروەردگار مرۆڤی وریا کردۆتەوە لەوەی بەدوای ئارەزووەکانی بکەوێ و، پێیانەوە سەرقاڵ بێ، لەسەر حیسابی ژیانی ڕۆژی دوایی:

بەڵێ بەزۆریی کە خوا سبحانه و تعالى لە نرخ و بەهای ژیانی دنیا دادەبەزێنێ و بەکەم وێنای دەکا، لەو ڕووەوەیە، کە مرۆڤەکان لەسەر حیسابی ڕۆژی دواییان سەرقاڵی ڕابواردنی ژیانی دنیا ببن، بەو ئیعتیبارەو لەو ڕووەوە، خوای کاربەجێ ژیانی دنیا کەم و کەم بایەخ دەخاتە بەرچاو، با بۆ نموونە تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین:

١- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ٥ ﴾ فاطر.

واتە: ئەی خەڵکینە! بەڵێنی خوا ڕاستە {ئەم ژیانە دەپێچرێتەوەو ڕۆژی دوایی دێ} بۆیە با ژیانی دنیا فریوتان نەدات و با فریودەر فریوتان نەدات {فریودەریش شەیتانە}.

٢- ﴿ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ٣٧ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ٣٨ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٣٩ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٤١ ﴾ النازعات.

واتە: هەر کەسێك یاخیی بێ و، ژیانی دنیا هەڵبژێرێ {دەفەرموێ: ژیانی دنیا هەڵبژێرێ، نافەرموێ: بیگوزەرێنێ، خوا ئێرەی داناوە کە بیگوزەرێنین، بەڵام دەبێ هەڵینەبژێری بەسەر ڕۆژی دواییداو، ئەوەندە پێیدا مەچۆ خوار کە ڕێگای دیداری خوات لێ بگرێ لە بەهەشتدا} ئەوە دۆزەخ جێی حەوانەوەیەتی، بەڵام هەر کەسێك لە مەقامی پەروەردگاری بترسێ و، نەفسی خۆی لە ئارەزووەکانی بگێڕێتەوە، ئەوە بەهەشت شوێنی تێدا حەوانەوەیەتی.

## بڕگەی شەشەم:

### ژیانێك كە لە ڕۆژی دواییدا هەیە، تەنیا ئەوە ژیانی ڕاستەقینەیە:

خوای پەنهانزان لەو بارەوە زۆر ئایەتی فەرمووە، بۆ نموونە:

لە سووڕەتی (العنكبوت) ئایەتی (٦٤)دا، خوای پەروەردگار دەفەرمویێ:

﴿وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾﴾.

واتە: ئەم ژیانی دنیایە تەنیا خافڵان و یارییەو، مەنزڵگای دوارۆژ هەر ئەو ژیانی ڕاستەقینەیە، ئەگەر بزانن.

یانی: ژیانێکی دنیایی پەنجا شەست ساڵ، حەفتا ساڵ، چییە؟ لەچاو سێزدە چواردە ملیار ساڵ کە گەردوون بەڕێی کردوە، بەس خواش دەزانێ چەندی دیکەشی بەدوادا دێ! بێگومان تەنیا چاو تروکانێکەو، هەر زۆر زۆر کەمە، چ جای لەچاو ژیانێکی هەمیشەیی لە بەهەشتدا کە هەر نابڕێتەوە!

جارێك کابرایەکی دنیایی پرسیاری لێ کردم گوتی: مامۆستا! زۆرم فکر کردۆتەوە، دەزانی بەهەشت ناخۆشە!!

گوتم: ناخۆشییەکەی لە چییدایە؟

گوتی: بۆ وێنە: ئێستا من لەماڵێ، خۆشترین خواردنم بۆ دابنێن، ماوەیەکە دوایی لێی وەڕس دەبم.

ئنجا پێم خۆشە سەفەرێ بکەم و بۆ شوێنێکی دیکە بچم {لەو کەسانەش بوو کە خەریکی ڕاو بوون} گوتی: ئنجا پێم خۆشە ڕاوێ بکەم، بەڵام لەبەهەشتدا هەموو شتێکت حازر دێتە بەردەستت و ڕاوی لێ نیەو، ڕاوی لێ نەبێ، زۆر ناخۆشە!!

ئنجا گوتی: ئەو هونەرمەندو گۆرانیبێژانە، بە پیاوو ژنەوە هەموویان لە دۆزەخدان، لەبەهەشتدا کەسی لەوان لێ نیەو، منیش دەنگی گۆرانیی و مۆسیقام پێخۆشە! {وا دیار بوو زۆر وشکە سەلەفییانە لە شتەکە حاڵی بووبوو} گوتی: وەك فکرم لێ کردۆتەوە: لە دنیادا زۆر شتی خۆش هەیە، لەبەهەشتێ لێی نیە!!

منیش گوتم: فلانکەس! ئەوەی تۆ بیرت لێ کردۆتەوە، وانیە، چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ﴿٧١﴾ ﴾ الزخرف.

واتە: (بەهەشت) هەرچی نەفستان دەیخوازێ، لێیەتی و هەرچی چاو لەززەتی لێ دەکا، لێیەتی.

گوتم: بۆ نموونە: تۆ ڕاوت پێ خۆش نیە؟ گوتی: با، گوتم: لە بەهەشتێ ڕاوی لێیە، بەپێی ئایەتەکە مادام تۆ ڕاوت پێ خۆشە.

ئنجا گوتم: دەنگی خۆشیش نەك هەر لەبەهەشتدا کە هیچ قەدەغەیەکی لێ نیە، لە دنیاشدا قەدەغە نیە! ئنجا دەنگی پیاوە، هی ئافرەتە، هی ئامێرە، کە بەتەئکید ئەوەی لەدنیادا هەیە، زۆر چاکتر لە بەهەشتدا هەیە، هەتا خوای کاربەجێ باسی شەڕاب (خمر) دەکات، کە بە دڵنیایی ئێمە نازانین هی دنیا چۆنە! بەڵام دەڵێن: کەسێك دەیخواتەوە، دەچێتە جیهانێکی خەیاڵیی! خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا شەڕاب دەخۆنەوە، بەڵام عەقڵیان لەدەست نادەن، ئنجا ئەوە چ خۆشییەکی تێدایە مرۆڤ شتێك بخواتەوە، دوایی بچێتە ڕیزی ئاژەڵ!!

بەڵێ با لێمان تێك نەچێ، کە ژیانی ڕاستەقینە لەوێیە، بەڵام بەو چەمك و واتا گشتییە نا، کە خەڵکێك گومان دەبات کە وەك چۆن ئێمە لە دنیادا پابەندین بە شەریعەتەوە، لە بەهەشتیشدا هەروایە! نەخێر بەڵام لەبەهەشتدا، ئەو مرۆڤانە لەسەر فیترەتێکی ساغ دەبن و، ئەو شتانەی لە ززەتیان لێ دەکەن، تەنیا ئەو شتانەن کە پەسندو چاکن و، فیترەتیان تەنیا داوای ئەو شتانە دەکات.

برگەی حەوتەم:

خوا عز وجل بە شێوەی جۆراو جۆر لە قورئانێدا هۆشداریی داوە بە مرۆڤەکان - هەروەها جندیش - کە درەنگ یان زوو ژیانی سەر زەوی دەپێچرێتەوە بەرەو قۆناغی بەرزەخ و پاشان ڕۆژی دوایی دەگوازنەوە.

بەڵێ ژیانی دنیا کاتێك دێ دەپێچرێتەوە، ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە: وەك چۆن هاتووین بۆ ئێرە، لێرەش لادەبرێین، ئایا کەس دەتوانێ نکووڵیی لەوە بکات کە بەبێ ئەوەی ئیرادەی ببێ، هێنراوە بۆ ئێرە، هەر لە ئادەم و حەوواوە سەلامی خوایان لێبێ، کە گوازرانەوە بۆ سەر زەوی، لە بەهەشتەوە، لەسەر ڕای هەندێك لە زانایانیش (جَنَّة): باغێك بووە لەسەر زەوی، کە من ئەو ڕایەم پێ بێهێزە، بەڵام بەهەر حاڵ ئەوەش ڕایەکە، دەڵێن: باغێك بووە لەسەر زەوی و هەموو پێداویستییەکانیانی تێدا بووە، دوایی دابەزێنراون بۆ ئەو ژیانەی سەر زەوی، بەبێ ئیرادەی خۆیان، ئنجا ئێمەش کە لەوان پەیدا بووین، بەبێ ویستی خۆمان، لەسەر زەوی دەیگوزەرێنین و ناتوانین لێشی دەربچین، دیسان بەهەمان شێوە کاتێکیش دێ، دەگوازرێینەوە بۆ قۆناغێکی دیکە.

ئنجا خوا سبحانە و تعالى لە زۆر ئایەتاندا ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە لەو ڕاستییەی کە کەس گومانی تێیدا نیە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب خوا لێی ڕازی بێ گوتەنی: {ما رأيت يقيناً أشبه بالظن، من الموت}، هیچ یەقینێکم نەبینیوە لە مردن زیاتر وەك گومان بچێ! ئێستا هەموومان دەزانین دەمرین، کەچی بەشەر وا سەرگەرمی دنیا دەبێ، وادەزانێ نامرێ! زۆربەی کێشەو تێکگیرانی خەڵك و عەیبداریی خەڵك، لەسەر ئەوەیە کە وادەزانن نامرن.

دەگێڕنەوە جارێك کابرایەك هات بۆ لای عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕەحمەتی خوای لێبێ، داوای هاوکاریی لێ کرد، ئەویش دە (١٠) درەم (درهم)ی زیوی

پێ بوون گوتی: فەرموو، کابراش تەماشای کردن و {لە خەلیفەکانی پێشی هەڵەبوو، کە بەدەیان دینارو سەدان درەمیان دەبەخشی! کە ئەو کاتە هەر دینارێکی زێڕ (١٠-١٢) درەمی زیو بووە} گوتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران! ئەوە هیچ کەلێنێکم بۆ ناگرێ، ئەوەندە زۆر کەمە، بەڵام بۆ بەرەکەتێ هەڵیدەگرم، تۆ پیاوێکی صاڵحی، ئەویش گوتی: لە هی خۆم، ئەوەندەم هەیە، لەهی (بیت المال)ی مسوڵمانانیشت پێ ناشێ، دیارە ناسیوپەتی پێی ناشێ! کابراش ڕۆیی، ئەویش بانگی کردەوەو گوتی: وەرە وەرە: ئەگەر پارەت کەم بوو، ویستت زۆر بێ، یادی مردن بکە، ئەو چەند درەمە بڵێ: ڕەنگە چەند سەعاتێکی دیکە بمرم، ئەو کات لەلات زۆر دەبن، هەروەها ئەگەر پارەشت زۆر بوو، ویستت لەبەر چاوت کەم بێ، هەر یادی مردنێ بکە، دەڵێی: ڕەنگە زوو بمرم و پێڕاناگەم بیخۆم!

ئەمەش چەند ئایەتێك وەك نموونە لەو بارەوە:

١- خوا سبحانه و تعالى لە دوو شوێنان لە قورئاندا ناوی لە مردن ناوە (یقین):

أ- لەسوورەتی (الحجر)دا، ئایەتی کۆتایی: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾.

واتە: پەروەردگاری خۆت بپەرستە، تاکو یەقینت دەگاتێ، بۆچی ناوی لە مردن ناوە یەقین؟ چونکە هیچ کەس دوو دڵ نیەو گومانی نیە لەوەدا کە دەمرێ.

ب- لە سوورەتی (المدثر)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾.

واتە: ئێمە هەر ڕۆژی سزاو پاداشتمان بەدرۆ دادەناو، لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بووین، هەتا یەقینمان گەیشتە سەر.

کاتی خۆی بزووتنەوەی (هەقە) لە گوندی (شەدەڵە)و ئەوانەی گوندی بارزانیش هەروا بوون، شێخەکە گوتوویەتی: من گەیشتوومەتە یەقین و نوێژ ناکەم و ڕۆژوو ناگرم!! بەڵام خوا دەفەرموێ: تاکو یەقین بۆتۆ دێت، واتە:

لەدەرەوەی خۆت یەقین بۆتۆ دێ، نەك هەتا تۆ دەگەیتە یەقین، ئەگەر وابووایە، دەیفەرموو: {حتی تصل الیقین}، بەڵام دەفەرمویٚ: {حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ } واتە: لەدەرەوەی خۆت بۆت دێ، کە مردنە.

بۆیەش پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) لە نەخۆشی مەرگیدا، کە بۆ نوێژی بە کۆمەڵ (جماعة) دەچوو، دوو کەس دەچوونە ژێر باڵی و[1] بە دانیشتنەوە نوێژەکەی دەکرد، چونکە خوا فەرمووبەتی: هەتا مردن دەگاتە سەرت، بەندایەتیی بۆ خوا بکە.

ئنجا ئەگەر مەبەست لە (یقین) دڵنیایی بووایە، وەك بەشێك لە بزووتنەوە باگنیهکان (الحرکات الباطنیة)ی کوردستان - بۆ نموونە: بە شێك لە صۆفییە هەقەکانی شەدەڵەو، بە شێك صۆفییە بارزانییەکان- گومانیان بردوە، یان شێخەکانیان خەڵکیان چەواشە کردوە، بە دڵنیایی پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی الله علیه وسلم) لە یەکەمین ڕۆژی وەحیی بۆ هاتنیەوە، یەقینی هەبووەو دەبووایە هەر لە سەرەتاوە گاعەتی نەکردبایە!!

٢- خوا لە سوورەتی (العنکبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۖ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ۝٥٧ ﴾.

واتە: هەموو نەفسێك مردن دەچێژێ، دوایی بۆ لای ئێمە دەگێڕڕێنەوە.

لەچەند شوێنێندا خوا ئەوەی باس کردوە، بۆ وێنە: لە سوورەتەکانی: (الأنبیاء -٣٥-، و آل عمران -١٨٥-، و العنکبوت -٥٧-)دا هاتوە {هەمو نەفسێك تامی مردن دەچێژێ} خوای پەروەردگار ئەو هەقیقەتەی بۆچی ئەوەندە دووبارە کردۆتەوە؟ لەبەر ئەوەی ئینسان لێی غافڵ دەبێ، ئنجا ئەوە ئاگادار کردنەوەو وریا کردنەوەیە کە ئەی خەڵکینە! مردن هەمووتان دەبێ بیچێژن، کە بێگومان ڕووح مردن دەچێژێ و ئازارەکە بە ڕووحەکە دەگا، چونکە ڕووح کە لە جەستە جیا دەبێتەوە، ئەوەی ئازار دەبینێ، ڕووحە، بەبەڵگەی ئەوە کە: هەر کە ڕووح

---

(١) السیرة النبویة لابن هشام، ٤ج ص ٣٨٧، دار ابن الهیثم، ط٢٠٠٦/١م.

لە جەستەدا نەما، وەرە پارچە پارچەی بکە، هیچ ئازاری پێ ناگات و تەنیا کاتێك ڕووح لە جەستە دایە، مرۆڤ ئازار دەچێژێ.

٣- هەروەها خوای پاك و تاك ڕایگەیاندوە: کە هەر کەسێك، هەر کاتێك وەختی مردنی هات، دوای ناخات:

﴿ وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١١﴾ ﴾ المنافقون.

واتە: هیچ کەسێك کە کاتی مردنی هات {(أجل) واتە: کاتی مردن} خوا دوای ناخات و، خواش شارەزایە بەوەی کە دەیکەن.

٤- ئنجا خوا ئەو هەقیقەتەشی ڕاگەیاندوە کە وەك چۆن هیچ کەسێك لەئەجەل دوا ناکەوێ، ئەجەلی لێ دوا ناکەوێ و، بەهەمان شێوە هیچ کەسێکیش ئەجەلی بۆ نایەت، ئەگەر بۆخۆشی بیەوێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًاۗ ﴿١٤٥﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: هیچ کەسێك بۆی نیە بمرێ، مەگەر بە مۆڵەتی خوا تۆمار کراوەو دیاریی کراوە.

خەڵکمان بینیوە ویستوویەتی: خۆی بکوژێ، بەڵام نەمردوە! خزمێکی ئێمە دەمانچەی لەسەر دڵی خۆی دابوو، لە پشتی هاتبووە دەرێ، بەڵام نەمردبوو، دڵ حەفتاو ئەوەندە جار لە خولەکێکدا دەکرێتەوەو خوێن دابەش دەکات و، دوایی دێتەوە یەك و خوێن دێنێتەوە، پزیشك گوتبووی: دڵی لەکاتی هاتنەوەیەکدا، فیشەکەکە بەتەنیشتیدا ڕۆیشتوە، ئەگەر لەو کاتەدا دڵی کراوەبایە، دڵی پارچە پارچە دەکرد! بەڵێ تاکو خوا نەیەوێ مرۆڤ نامرێ و، کاتێکیش کە خوا ویستی، هەر دەمرێ، بیەوێ یان نەیەوێ!

## بــەرایی

خوێنەری سەنگین و شیرین!

لەم بەشی دووەمەی تەوەری چوارەمدا، بنەڕەتەكانی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بە كورتیی و پوختی دەتوێژینەوە، ئەویش لە شەش باس (مبحث)دا، بەم ناوو نیشانانەی خوارێ:

**باسی یەكەم: پێناسەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی.**
**باسی دووەم: بنەڕەتەكانی ئیمان (أركان الإيمان).**
**باسی سێیەم: پێكهاتەكانی ئیمان (مُكَوِّنات الإيمان).**
**باسی چوارەم: بڕوادار (مؤمن) كێیە؟**
**باسی پێنجەم: ئایا كردەوە بەشێكە لە ئیمان، یان نا؟!**
**باسی شەشەم: پلەكانی ئیمان (درجات الإيمان).**

شایانی باسیشە ئەم بەشە هەمووی، لە كتێبی دووەم (الكتاب الثاني: مفهوم الإيمان والكفر وثمارهما)ی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) وەرگیراوە، بەڵام بە گوشین و كورتكردنەوەی زۆرەوە.

باسی
یەکەم

## پێناسەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە خوای بەرز لە قورئاندا - ئەوەی تێبینی دەکرێ - پێناسەی هیچ شتێکی نەکردوە بە پێناسەیەکی تیۆریی (نظري) وەك ئێستا باوە، ئەوە لە قورئاندا نیە خوا سبحانە و تعالى فەرموویێتی: ئیمان بریتیە لە فلان شت و فلان شت، یان بۆ وێنە: جەنگ و جیهاد ئەوە پێناسەکەیەتی، چونکە ئەوە پێی دەگوترێ: پێناسەی دارِنینیی (التعريف التجريدي) بەڵام ئیمانی ڕووت (الإيمان المجرَّد) بوونی نیە، هەروەها (تقوى) بە تەنها بوونی نیە، بەڵکو (مؤمن) هەیە کە هەڵگری ئیمانەو، (متَّقي) هەیە کە هەڵگری تەقوایەو، (محسن) هەیە کە هەڵگری ئیحسانەو ....هتد.

ئنجا ئێمە لە پێناسەی ئیماندا سەرەتا، ئەوە دەڵێین کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەری پێك هاتوون، دەڵێن: {الإيمان: قول وعمل، قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح} واتە: ئیمان قسەو کردەوەیە، قسەی دڵ و زمان و، کردەوەی دڵ و ئەندامەکان.

هەموو زانایانی موعتەبەر لەسەر ئەو پێناسەیە ڕێککەوتوون، کە دوایی شیی دەکەینەوە، بۆچی ئەو پێناسەیان هێناوە؟!

ئنجا ئەگەر تەماشای قورئان بكەین، ئەم پێنج ڕاستییەمان چنگ دەكەون لەبارەی ئیمانەوە، كە لە پێنج بڕگەدا دەیانخەینە ڕوو:

## بڕگەی یەكەم:

### ئیمان وەك هەقیقەتی خۆی، تەنیا لەڕێی وەحییەوە دەزانرێ:

بەڵێ تەنیا لەڕێی وەحییەوە دەزانین: ئیمان چییەو، كەی ئیمان پەیدا دەبێ و، ئیمان بەچی و چی پێویستە؟ ئەوەشمان لە ئایەتی (٥٢)ی سووڕەتی (الشورى) دەرهێناوە، كە خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾.

سەرەتا خوای كاربەجێ لە ئایەتی پێشتردا باسی ڕێگاكانی ناردنی وەحیی دەكات، كە لە سێ ڕێگادا كورتیان دەكاتەوە:

أ- خستنە نێو دڵ.

ب- لە پشت پەردەوە دواندن.

جـ- ناردنی فریشتەیەكی نوێنەر.

﴿وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾﴾ الشورى.

دوایی دەفەرموێ: هەروەك چۆن وەحییمان بۆ پێغەمبەرانی دیكە نارد (سەلامی خوایان لێ بێ) بەو شێوەیەش ڕووحێكمان لەلایەن خۆمانەوە بۆتۆ ناردوە {كە مەبەست پێی قورئانە} پێشتر نەتدەزانی نە بەرنامە چییە؟ {كتاب: لێرەدا مەبەست پێی بەرنامەیە} نە ئیمانیش چییە؟ بەڵام ئێمە گێڕامان بە

ڕووناکییەك، هەرکەس بمانەوێ لە بەندەکانمان پێی ڕێنمایی دەکەین و، بە دڵنیایی تۆش خەڵك دەخەیە سەر ڕاستە شەقام.

کەواتە: ئیمان لەڕێی وەحییەوە دەزانرێ، بەڵام وەك پێشتریش باسمان کرد: ئایا کەسێك کە دەزانێ: خوا هەقە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەقە، ڕۆژی دوایی هەقەو، فریشتەکان و کتێبەکان، هەقن، وەك ئەهلی کیتاب، کە ئەوانە دەزانن، بەڵام ئایا ئەهلی کیتاب بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێن؟ نەخێر، چونکە زانینی شتێك جیایە لە ئیمان بەو شتە، زانینی ئەو شتەیە، ئەوەیە کە دەزانی چۆنە؟ بەڵام ئیمان پێی یانی: تۆ ئەو شتەت بەدڵ قبووڵ کردبێ و پەسەند کردنت بۆی هەبێ، ئنجا لەوانەیە یەکێ بڵێ: جوولەکەکان و مەسیحییەکان ئەوەیان هەیە؟ دەڵێین: ڕاستە، بەڵام دەبێ پەسند کردنەکە بەو شێوەیەش بێ کە خوای پەروەردگار ویستوویەتی لەو مرۆڤایەتییەی کە دوای ڕەوانە کردنی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دێ، ئنجا ئەوەش کە خوا لە ئێمەی ویستوە، ئەو ئیمان و تاعەت و عیبادەت و بەندایەتییەیە، کە لەڕێی پێغەمبەری خاتەمەوە ناردوویەتی، دەبێ ئەوەت پەسند بێت، وێڕای ئەوەی بە عەقڵ دەیزانی، بە دڵیش قبووڵی بکەی و، بەزمانیش دانی پێدا بێنی و، بە ئەندامەکانیش پێیەوە پابەند بی.

## بڕگەی دووەم:

### شوێنی سەرەكیی ئیمان بریتیە لە دڵ:

خوا سبحانه وتعالی لە چەند شوێنێك لە قورئاندا، ئەو ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە:

١- ﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡ ﴿١٤﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: عەرەبە خێڵەكییەكان گوتیان: ئیمانمان هێناوە، بفەرموو: ئیمانتان نەهێناوە، بەڵكو بڵێن: مسوڵمان بووین {واتە: بە ڕواڵەت و ڕووكەشیی هاتووینە نێو ئیسلامەوە}و جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوە.

كەواتە: ئیمان دەچێتە نێو دڵەوە.

٢- هەروەها خوای كاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ ﴿٢٢﴾ ﴾ المجادلة. واتە: ئیمانی لەدڵدا نووسیون {واتە: چەسپاندوویەتی}.

كەواتە: ئیمان لەدڵدا دەچەسپێ، یەكێ بۆی هەیە بڵێ: كەواتە: ئیمان تەنیا بریتیە لەوەی لەدڵدا دەچەسپێ! دەڵێین: نا، بەڵام بەشی سەرەكیی و بنەڕەتیی ئیمان لەدڵدا دەچەسپێ، ئەگەرنا ئەوەی كە بە زمانیش تەعبیر دەكرێ، هەر ئیمانەو، ئەوەشی كە بە عەقڵ دەرك دەكرێ، هەر ئیمانەو، ئەوەش كە دوایی پراكتیزەو تەتبیق دەكرێ بە ئەندامەكان، هەر ئیمانە، وەك دواییش دەیگەینێ، بەڵام بەشی سەرەكیی ئیمان ئەوەیە كە لە دڵ و دەرووندا جێگیر دەبێ، لەبەر ئەوەی ئەوانی دیكە هەموویان دەگونجێ خەڵكی دیكەش هەیبن: بە زمان مونافیقەكانیش دەیانگوت و، بە كردەوەش دەیانكرد، ئەدی چییان نوقسان بوو؟ ئەو هەقیقەتە كە لە دڵدا جێگیر دەبوو، ئەوەیان نەبوو، چونكە جاری وا هەیە زانینەكەشیان هەیە، بۆ وێنە: ئیبلیس دەزانێ خوا هەقە، بەڵام ئەو زانینەی بە ئیمان لەقەڵەم نادرێ، چونكە پەسند كردن و ملكەچیی لەگەڵدا نیە.

## بڕگەی سێیەم:

ئیمان زیاد دەکات بە هەر شتێك كە بە تاعەت لەقەڵەم دەدرێ، بە هەموو ئەو چالاکیی و جموجۆڵە پەنهان و ئاشکرایانەی کە بە فەرمانبەریی بۆ خوا دادەنرێن:

خوای پەروەردگار ئاوا پێناسەی ئیمانداران دەكات، كە بەهۆی فەرمانبەرییەوە ئیمانیان زیاد دەكات:

١- ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: ئیمانداران تەنیا ئەوانەن کە کاتێ یادی خوا دەکرێ، دڵیان ڕادەچڵەکێ و، کاتێك ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنرێتەوە، ئیمانیان زیاد دەکات تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و لەوەی پێمان داون و لەوەی پێمان داون دەبەخشن ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، لەلای پەروەردگاریان چەندان پلەیان هەن وێڕای لێبوردن و بژێوێکیی پەسندو بژاردە.

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: ئەوانەی خەڵك پێیان گوتن: خەڵك لە دژتان کۆبوونەتەوە لێیان بترسن! بەڵام ئەوە ئیمانی زیاد کردن و گوتیان: خوامان بەسەو ئەو باشترین کار پێ سپێرراوە.

کەواتە: ئیمان جاری وا هەیە لە میحنەت و لەژێر فشارداو، لە کوورەی نارِەحەتیی و گرفتارییاندا زیاد دەکات، یانی: ئیمان مەرج نیە تەنیا بەبارە ئیجابییەکەیدا، بەهۆی نوێژو تاعەت و زیکری خواو، ئایەت خوێندنەوەو، ئایەت بەسەردا خوێنرانەوەوە، گەشە بکاو زیاد بکات، بەڵکو جاری وا هەیە، بەهۆی هەرِەشە لێکرانەوەو بەهۆی فشارەوە، ئیمان زیاد دەکات، ئەوەش شتێکی ئەزموون کراوە.

تیغی رِەسەن هەتا شتی پێ ببرِێ ساف (صَقْل) دەبێ، سپی دەبێ و ئەگەر ژەنگی پێوەبێ لێی دەبێتەوە.

## بڕگەی چوارەم:

کردەوە ڕواڵەتەکان و پابەندیی بە شەریعەتەوە، لە قورئاندا بە ئیمان ناوبراون:

١- وەك خوای کاربەجێ لەباسی گۆڕانی ڕووگە (قبلة)دا دەفەرمویّ:

﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٤٣﴾ البقرة.

واتە: خوا ناگونجێ ئیمانەکەتان زایە بکات، بە دڵنیایی خوا بەرانبەر بە خەڵك، میهرەبان و بەبەزەییە.

هەموو توێژەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە لێرەدا: {(إِيمَـٰنَكُمْۚ) أي: صلاتكم} ئیمانتان یانی: نوێژتان، چونکە کاتێك مسوڵمانان فەرمانیان پێکرا کە لە (بيت المقدس)ەوە، ڕوو وەرسووڕێنن بەرەو کەعبە، هەندێکیان کە خزمانیان شەهید بووبوون، یان وەفاتیان کردبوو، لە نوێژەکانیشیاندا ڕوویان لە (بيت المقدس) کردبوو، بۆیان نیگەران بوون و گوتیان: ئەو خزمانەمان نوێژەکانیان ڕوو بەرەو (بيت المقدس) کردوە، خوای بەرزو مەزنیش ڕووی پێ وەرسووڕاندین بەرەو کەعبە! کەواتە: دەبێ نوێژو تاعەتەکەیان زایە بووبێ! خواش فەرمووی:

﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْۚ ١٤٣﴾ البقرة.

واتە: خوا ئیمانەکەتان زایە ناکا، کە بەتەئکید مەبەستی پێ نوێژە، یانی: ئەو نوێژانەی کە ڕوو بە (بيت المقدس) کراون، ناوی لێ ناون ئیمان[1].

٢- هەروەها خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَـٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَـٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَـٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَـٰتُ

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري: ٢٣٤٠.

مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾ المائدة.

واتە: ئەمڕۆ شتە چاك و خۆشەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون و، خۆراكی (گۆشتی) خاوەن كتێبان بۆ ئێوە حەڵاڵەو، خۆراكی ئێوەش بۆ وان حەڵاڵە، هەروەها ئافرەتانی پاكیزە لە بڕواداران و ئافرەتانی پاكیزە، لەوانەی پێش ئێوە كتێبیان پێدراوە، ئەگەر كرێ (مارەیی)ەكانیانتان دانێ، لە حاڵێكدا كە خۆ پاك ڕاگرن و بەپەنهانیی دۆستان ناگرن (بە ئاشكراو پەنهان زینا ناكەن) هەر كەسێكیش كوفر بە ئیمان بكات، كردەوەكەی هەڵوەشاوەتەوەو لە دوا ڕۆژیشدا لە زیانبارانە.

وەك دەبینین: ئەوەی كە باس كراوە، هەمووی پابەند بوونە بە حەڵاڵ و حەڕام و شەریعەتەوە، دوایی خوا دەفەرمویٚ:

﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾﴾ المائدة.

واتە: هەر كەسیٚ كوفر بە ئیمان بكات، كردەوەكەی هەڵوەشاوەتەوەو لە دواڕۆژیشدا لە زیانبارانە.

دیارە مەبەست لە ئیمانیش لەو سیاقەدا، پابەند بوونە بە حەڵاڵ و حەڕامێكەوە، كە خوا ناردوویەتی، لەبواری هاوسەرگیریی و لەبواری خواردن و خواردنەوەدا.

برگەی پێنجەم:

ئیمان مرۆڤ بۆخۆی وەدەستی دێنێ، بەڵام بە ئاسان کردنی خواو، بە ڕێنمایی و تەوفیقی وی:

دەتوانین لەو بارەوە ئاماژە بە چەند ئایەتێك بکەین:

١- لە سوورەتی (الأعراف)دا، ئیمانداران دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِىَ لَوْلَآ أَنْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ ۖ لَقَدْ جَآءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلْحَقِّ ۖ وَنُودُوٓا۟ أَن تِلْكُمُ ٱلْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾.

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کردین بۆ ئەو (ڕێباز)ەو، ئەگەر خوا ڕێنمایی نەکردباین ئێمە ڕێمان پێ نەدەزانی....

٢- هەروەها لە سوورەتی (آل عمران)یشدا، ئیمانداران دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ﴿١٩٣﴾﴾ آل عمران.

واتە: پەروەردگارمان! ئێمە گوێمان لە بانگکەرێك بوو بانگی دەکردین: ئیمان بێنن بە پەروەردگارتان، ئێمەش ئیمانمان هێنا.

٣- خوا سبحانه و تعالی تەنانەت بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ﴿مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ ﴿٥٢﴾﴾ الشوری.

واتە: پێش ئەم ڕووحە، پێش ئەم وەحییەی بۆت هات، نەتدەزانی نە کتێب چییە؟ نە ئیمانیش چییە؟

یەکێ بۆی هەیە بڵێ: چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیمانی نەبووە؟! هەڵبەتە ئەگەر بشڵێین: ئیمانی نەبووە، زۆر ئاساییە، چونکە

هەر چەندە پێغەمبەری خاتەم (محمد) (صلی الله علیه وسلم) پێش وەحیی بۆ هاتن، خوای ناسیوەو، خوا پاراستوویەتی لەو شتانەی ناشیرینکەرن، بەڵام ئەگەر شتێکی نەزانیبێ، کە ئەو شتە لە ڕێگای وەحییەوە نەبێ نازانرێ، ئەوە نوقسانیی نیەو، ناسینی خواش، جیایە لە ئیمان بەخوا، وەك پێشتریش گوترا.

پێناســـەی بـــەندە بۆ ئیمـــان:

بەندە ئیمانم ئاوا پێناسە کردوە: {الإيمان هو النور التي يكتسبه الإنسان بتوفيق الله وتيسيره وهدايته، و مستقره القلب، ولكن ينعكس ضياؤه على باطن الإنسان، فَيُثْمِرْ فيه اليقين والطمئنينة والتصديق، وكذلك ينعكس على ظاهره، فَيُزَيِّنُهُ بالإقرار والسمع والطاعة والإتِّباع، ويجعله مُتَحَلِّياً بالفضائل النفسية والخُلُقيَّة، كالشمس الذي تُضيءُ بِأَشعَّتها ما حولها وما بَعُدَ عنها}.

واتە: ئیمان ئەو ڕۆشناییەیە کە مرۆڤ بە ئاسانکاریی و ڕێنمایی و بە دەست گرتنی خوا، وەدەستی دێنێ و، شوێنی سەرەکیی ئیمان، دڵە، بەڵام ڕۆشنایی ئیمان هەموو دەروونی ئینسان ڕووناك دەکاتەوەو، دڵنیایی و ئارامیی و بەڕاست زانینی تێدا دەچەسپێنێ، هەروەها ئیمان لەسەر ڕواڵەتی ئینسانیش دەردەکەوێ، ڕواڵەتەکەشی بەدانپێداهێنانی زمان و، گوێ گرتن و، بە فەرمانبەریی و شوێنکەوتن، جوان دەکات و، وا لە مرۆڤ دەکات ڕازاوە بێت بە سیفەتە بەرزە دەروونیی و ڕەوشتییەکان، وەك خۆر کە بە تیشکەکەی دەورو بەری خۆی ڕووناك دەکاتەوەو، ئەوەی کە لێشی دوورە، ڕووناکی دەکاتەوە.

ئەمە پێناسەیەکی کورتی ئیمان بوو، کە دواییش لە باسی پێك هاتەکانی ئیماندا، لە بارەیەوە دەدوێین.

# باسی دووەم

## بنەڕەتەکانی ئیمان

لە قورئاندا خوای پەروەردگار باسی پێنج بنەڕەت دەکات، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بنەڕەتی شەشەمیش خراوەتە گەڵ ئەو پێنجانە، کە دوایی باسی دەکەم حیکمەتەکەی چییە، ئنجا ئەو پێنج بنەڕەتەی کە لە قورئاندا باس کراون، لە سێ شوێندا هاتوون:

١- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٧٧)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ ﴿١٧٧﴾ ﴾.

واتە: چاکەکاریی ئەوە نیە ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا {مسوڵمانەکان لەگەڵ جوولەکەکان و نەصرانییەکاندا، مشت و مڕیان بووە لەسەر قیبلە، هی کێ باشترە؟} بەڵکو چاکەکاریی سیفەتی کەسێکە، بڕوای هێناوە بەخواو بە ڕۆژی دوایی و، بە فریشتەکان و، بە کتێبەکانی خواو، بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ).

لێرەدا خوا پێنج بنەڕەتی ئیمانی خستوونە ڕوو: ئیمان بەخوا و ڕۆژی دوایی و فریشتەکانی خوا و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی.

٢- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٣٦)دا، دیسان خوا باسی ئەو پێنج بنەڕەتە دەکات، بەڵام بەو شێوازە کە: کوفر بریتیە لەنکووڵیی کردن لەو پێنج بنەڕەتە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ ﴾.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بڕوا بێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبەی کە ناردوویەتە سەر پێغەمبەرەکەی و بەو کتێبەی (واتە: بە کۆی ئەو کتێبانەی) کە پێشتر ناردوویەتە خوارو، هەر کەسێ بێ بڕوا بێ: بە خواو بە فریشتەکانی و، بەکتێبەکانی و، بە پێغەمبەرانی و، بەڕۆژی دوایی، ئەوە بە گومڕاییەکی دوور گومڕا بووە.

خوێنەرانی بەڕێز!

جێی تێبینیی ئەوەیە کە لە ئایەتی (١٧٧)ی (البقرة)دا، ئیمان بەخوا پێش کەوتوەو، ئیمان بە ڕۆژی دوایی، یەکسەر بنەڕەتی دووەمە، چونکە لەڕووی گرنگییەوە، ئیمان بەخوا بناغەیە، دوای ئەو یەکسەر ئیمان بە ڕۆژی دوایی دێ، ئنجا ئیمان بە فریشتەکان و کتێبەکان و پێغەمبەران، بەڵام لێرەدا (ئایەتی (١٣٦)ی النساء) باسی کوفرە، ئنجا هەر کەسێ بێ بڕوا بێ، لە سۆنگەی ئەوەوە کە دوایین شت کە بابای بێ بڕوا بیری لێ دەکاتەوە، بریتیە لە ڕۆژی دوایی، بۆیە خوای کاربەجێ ئەوی خستۆتە دوایە.

٣- هەروەها لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (٢٨٥)دا، دیسان باسی بنەڕەتەکانی ئیمان کراوە، بەڵام لەوێدا باسی چواریان کراوە:

﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ ۚ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ ﴾.

وەك دەبینین: لێرەدا تەنیا باسی بڕوا بەخواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی کراوە، یانی: باسی چوار بنەڕەت لە پێنج بنەڕەتەکانی ئیمان کراوەو، باسی ڕۆژی دوایی نەکراوە، لەبەر ئەوەی سیاقەکە نەیخواستوە.

٤- پێغەمبەری خاتەمیش (صلی الله علیه وسلم) لەو فەرموودەیەدا کە بە (حدیث جبریل) ناسراوە، دەفەرموێ: {قَالَ: أَخْبِرْنِي عَنْ الْإِيمَانِ، قَالَ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ} أخرجه البخاري برقم: (٥٠) ومسلم: برقم (١).

جوبریل لە پێغەمبەرمان (محمد) (صلی الله علیه وسلم) دەپرسێ: هەواڵم پێ بدە دەربارەی ئیمان؟ ئەویش دەفەرموێ: ئیمان ئەوەیە: ئیمان بێنی بەخواو، بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی و، بە پێغەمبەرانی و، بە ڕۆژی دوایی و، ئیمان بێنی بە قەدەر {واتە: ئەندازەگیریی و نەخشەی خوا} کە چاکی و خراپی، {بەنسبەت ئێمەوە} یانی: ئەوەی کە پێت خۆشەو، ئەوەش کە پێت ناخۆشە، ئەوەی کە لەبەرژەوەندیی خۆتی دەزانی و، ئەوەشی کە لە زیانی خۆتی دەزانی {هەمووی لەلایەن خواوەیە}.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ:

بۆچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو پایەی بۆ زیاد کردوە؟ دەڵێین: ئەوەش یەکێکە لەو شتانەی کە خوا دەفەرموێ:

﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: تاکو ئەوەی بۆ خەڵك دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زانیویەتی کە ئۆممەتی مشت و مڕیان دەبێ لەسەر قەدەر، بۆیە ئیمان بە قەدەریشی خستۆتە پاڵ ئەو پێنج بنەڕەتە، ئەدی لە ئایەتەکاندا بۆچی نەهاتوە؟! دەڵێین: لەڕاستیدا ئیمان بەقەدەر هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بەخوا، یانی: ئیمان بێنی بە زانیاریی گشتگیری خواو، ویستی ڕەهای خواو، توانای بێ سنووری خواو، حیکمەتی خوا، کەواتە: ئیمان

بەقەدەر دەچێتەوە نێو ئیمان بەخوا، ئەوە کە خوا نەخشەی ئەو بوونەی داناوە، پێش ئەوەی دروستی بکات و، هەموو شتێکی زانیوەو هەموو شتێکی لەبارەوە دەزانێ و، هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا دروست نابێ و، دروست نەبووەو بەڕێوە ناچێ، ئیمان بەقەدەر ئەوەیە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا خوای بێوێنە دادگەرەو ستەمی لەکەس نەکردوەو ناکات و کاربەجێشە.

هەروەها ئیمان بەقەدەر دیسان دەچێتەوە نێو ئیمان هێنان بە کتێبەکانی خواو، بە پێغەمبەرانی خوا، چونکە ئەوانیش باسی قەدەریان کردوە.

ئنجا خواش سبحانه و تعالى لە زۆر لە ئایەتەکاندا باسی ئەندازە گیریی خۆی کردوە، بۆ بوون و گەردوون، بۆ نموونە:

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر.

واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی خوڵقاندوە.

بەڵێ خوا هەموو شتێکی دروستکردوەو ئەندازەشی بۆ داناوەو، ئەوەش شتێکی زۆر مەنتیقییە، کە خوا سبحانه و تعالى تێکڕای دروستکراوەکان: پێش ئەوەی بیانهێنێتە دی، نەخشەی بۆ دانابن و، هەموو شتێکی لەبارەوە زانیبن.

چونکە کەسێك بیەوێ بینایەك دروست بکات، پێشێ نەخشەکەی لەسەر کاغەز دەکێشێ، ئنجا دوایی ئەو نەخشەیە تەسلیمی کۆمەڵێك وەستاو کرێکار دەکات و پێیان دەڵێ: وەرن ئەم نەخشەیە جێ بەجێ بکەن، (ولله المَثَل الأعلى) خوای پەروەردگاریش بەر لەوەی ئەو دروستکراوانەی خۆی بێنێتە دی، هەموو شتێکی دەربارەی دروستکراوەکانی خۆی زانیوەو، نەخشەشی بۆ داناون و، بەو نەخشەیەی خواش هەموو شتێك جێبەجێ دەبێ.

چونکە جار جارە شەیتان وەسوەسە دروست دەکات، دەڵێ: خوا ئەو هەموو دروستکراوانەی دروست کردوون، لەوانەیە دوایی بڕیار بدات: با زیندوویان نەکەمەوە! نا، خوا خاوەنی هەرچی سیفەتی بەرزو پەسەندەو، ئەوەش کە دروستکراوەکان دروستبکات و، دوایی لێیان نەپێچێتەوەو، شتەکان نەگەیەنێتە

شوێنی خۆی، ئەوە شایستەی خوای تاك و پاك نیە، بۆیە خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: ئایا پێتان وایە بە گاڵتە دروستمان کردوون و بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟ بەرزیی بۆ خوای پادشای هەق {خوا پادشاو، خاوەن و، حوکمڕانی هەقە، بەرزیی بۆ وی کە لە ئێوە نەپێچێتەوەو نەتانگێڕێتەوە بۆ لای خۆی و سزاو پاداشتتان نەداتەوە} بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، خاوەنی بارەگای پەسندو بەڕێزە.

## باسی سێیەم

## پێکهاتەکانی ئیمـان

ئەم باسەش تیشکی زیاتر دەخاتە سەر نێوەڕۆکی ئیمان و پێناسەی ئیمان.

زانایان - وەك پێشتریش باسمان کرد - ئاوا پێناسەی ئیمانیان کردوە:

{الإيمان: قول وعمل، قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح}.

با تۆزێك ئەم پێناسەیە شی بکەینەوە:

١- {قول القلب}: قسەی دڵ، یانی: مەعریفەتی دڵ، یانی بە عەقڵ و بە دەروون، ئینسان ئەو شتانە بزانێ، کە دەبێ ئیمانیان پێ بهێنێ، وەك پێشتر لە باسی بوونناسییدا باسمان کرد، واتە: زانین و پەی پێ بردنی عەقڵ.

٢- {قول اللسان}: قسەی زمان، ئەوەیە مرۆڤ دان بەهەموو ئەو شتانەدا بێنێ کە لەبارەی ئیمانەوە زانیونی.

٣- {عمل القلب}: کردەوەی دڵ، ئەوەیە کە مرۆڤ هەموو ئەو شتانەی لە بارەی ئیمانەوە زانیونی، بەڕاستیان بزانێ و خۆشی بوێن و قبووڵ و پەسندیان بکات.

٤- {عمل الجوارح}: کردەوەی ئەندامەکان، یانی: دەبێ مرۆڤ بەپێی خواست و داخوازیی ئەو هەقیقەتانە کە بەعەقڵ دەرکی کردوون و، لەدڵدا جێگیر بوون و، زمان دانی پێدا هێناون، ئەندامەکانیش بەو پێیە ڕەفتار بکەن.

چونکە ئینسان چوار هێزی هەن و، هەموو بوونی ئینسان لەو چوار هێزەدا خولاصە دەبێتەوە، ئنجا ئەگەر بەپێی ڕیزبەندیی لە گرنگترەوە بۆ گرنگ، ڕیزیان بکەین، بەمجۆرەن:

**یەکەم:** عەقڵ: هێزی زانین: ئینسان بە عەقڵ شتەکان دەزانێ.

**دووەم:** دڵ: هێزی ویستن و نەویستن: ئینسان بەدڵ شتەکانی دەوێن، یاخود نایەوێن، قبووڵیان دەکات، یان ڕەفزیان دەکات.

**سێیەم:** هێزی دەربڕین: کە لە زماندا بەرجەستە دەبێ، یاخود ئەوەی لەجێی زمانە، وەك نووسین.

**چوارەم:** هێزی جێبەجێ کردن: کە بریتیە لە جەستەو ئەندامەکان.

ئنجا ئیمان پەیوەستە بە هەر کام لەم چوار هێزانەوە، بۆیەش زانایان ئاوایان پێناسە کردوە:

{الإيمان: قول القلب واللسان، وعمل القلب والجوارح}، ئینسان سەرەتا دەبێ بەو عەقڵ و هۆشە کە هەیەتی، ئەوەی کە دەبێ ئیمانی پێ بێنێ: خوا تبارك و تعالى، فریشتەکان، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەران، ڕۆژی دوایی، دەبێ مەعریفەت و شارەزایی دەربارەیان هەبێ، بۆیەش گوتمان: لە پێش ئیمانەوە قۆناغێکی دیکە هەیە کە بریتیە لە بووناسیی (المعرفة) بەڵام ئەوە ئیشی عەقڵەو بەس بناغە دادەنێ بۆ پەیدا بوونی ئیمان، بەڵام پێی ناگوترێ: ئیمان، چونکە کافرو مسوڵمان، تێیدا بەشدارن، وەك ئیبلیس و فیرعەون و ئالی فیرعەون و ئەبو جەهل، هەموویان هەقیان زانیوە، بەڵام دانیان پێدا نەهێناوە.

گێڕراوەتەوە کە یەکێ لە قوڕەیش بەناوی (الأخنس بن شُريق) بە ئەبو جەهلی گوت: ئەی ئەبولحەکەم! ڕات چییە لە بارەی ئەوەوە کە لە موحەممەدت بیست؟!

گوتی: چیم بیست! {مەبەستی ئەوەبووە شتێکی سەر سوڕهێنەری بیستوەو دەزانێ کە موحەممەد پێغەمبەری خوایەو قسەی ناڕاست ناکات}.

{ئنجا ئەبو جەهل گوتی}: عەشیرەتی ئێمە (بنو عبدالشمس)، لەگەڵ عەشیرەتی (بنو عبد مناف)دا هەر پێشبڕکەمان بوو {لەسەردەمی نەفامییدا}، ئەوان خواردنیان بەخشی، ئێمەش خواردنمان بەخشی، ئەوان پەلاماری دوژمنیان دا، ئێمەش بەهەمان شێوە هێرشمان کرد، ئەوان بەخشییان، ئێمەش بەخشیمان ئنجا کاتێك کە وەك دوو ئەسپ سواری پێشبڕکەکەر بەرانبەری یەك بووین، ئێستا ئەوان دەڵێن: پێغەمبەرێکمان لەنێودا هاتوە، وەحیی لە ئاسمانەوە بۆ دێ، ئەدی ئێمە پێغەمبەرێك لەکوێ بێنین! {دەبێ بەدوای ئەوان بکەوین و} بە خوا، هەرگیز کاری وا ناکەین، بڕوای پێ ناهێنین و بەڕاستی دانانێین[١].

هەروەها گێڕراوەتەوە: کاتێك موسەیلیمەی درۆزن (مُسَيلِمة الكذاب) پەیدا بوو، بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی دەکردو هەندێ وتەی دانابوون، بە حیسابی خۆی لەجێی ئایەتان، یەکێ لەوانە:

(الفيل، ماالفيل، وما أدراك ماالفيل، له أذنان عريضان، وخرطوم طويل)!! ئنجا دەڵێ یەکێ بەوەی دیکەی گوت: ئەرێ ئەو پێغەمبەرەی ئێمە ئەو قسانە دەکات، هیچ وەك ئایەتی خوا دەچن؟ کابراش گوتی: ناوەڵڵا، برادەرەکەشی گوتی: کەواتە: بۆچی بڕوا بە موحەممەد نەهێنین؟! کابراش گوتی: (كذاب ربيعة أحبُّ إليَّ مِن صادِقِ مُضَر)[٢] واتە: درۆزنی ڕەبیعەم لەلا خۆشەویستترە، لە ڕاستگۆی موزەڕڕ، واتە: درۆزنەکەی خۆمانم خۆشتر دەوێ لە ڕاستگۆکەی ئەوان.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام، ج١ ص١٥٩، دار ابن الهيثم/ ٢٠٠٦م.

(٢)جمع الجوامع أو الجامع الكبير للسيوطي ج٣، ص ٣٦٠.

مەبەستم ئەوەیە کە ئەوان وەك زانین، زانیویانە، بەڵام هەق زانین بەعەقڵ بەتەنیا نابێتە ئیمان، هەتا پێکهێنەرە سەرەکییەکانی دیکەی نەچنە پاڵ، هێزی ویستن و، هێزی دەربڕین و، هێزی جێبەجێ کردن، هەڵبەتە ئەو دڵە گۆشتیینە، پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بە دڵە مەعنەوییەکەوە، کە خوا باسی دەکات، بەڵام بەتەئکید مەبەست لەو دڵە مەعنەوییە، ئەو دڵە گۆشتیینە نیەو، ڕاستییەکەی هەموو ئەو شتانە، ئیشی ڕووحن:

١- چونکە ڕووح: عەقڵ بەکار دەهێنێ بۆ دەرك کردن.

٢- دڵ بەکار دەهێنێ بۆ ویستن و نەویستن.

٣- زمان بەکار دەهێنێ بۆ دەربڕین.

٤- ئەندامەکانیش بەکار دەهێنێ بۆ جێبەجێ کردن.

کەواتە: ئەو مشت و مڕەی لە بارەی ئیمانەوە لەنێو زانایاندا بووە، کە ئایا ئیمان بریتیە لە چی؟ لێرەوە چارەسەر دەبێ و هەق دەدرەوشێتەوە، کە جەهمییەکان گوتوویانە: ئیمان بەس بریتیە لە زانین (معرفة)! کە ئەگەر وا بێ، دەبوو ئیبلیس لە هەموو کەس ئیماندارى باشتر بێ، هەروەها فیرعەون و ئەبو جەهل و ...هتد، ئەوانە دەیانزانی پێغەمبەرانێك کە بۆیان هاتوون، هەقن، بەڵکو ئیمان پەیوەندیی بە هەموو کەینوونەی ئینسانەوە هەیە، کە لە چوار هێزەکەیدا بەرجەستە دەبێ:

١- زانین و پەیپێبردن (المعرفة والإدراك).

٢- ویستن و پەسند کردن (الإرادة والقبول).

٣- دەربڕین و دانپێداهێنان (الإقرار والتصديق).

٤- جێبەجێ کردن و ئەنجامدان (العمل والتنفيذ).

ئـــایـــا بۆچی خوای پەروەردگار زیاتر باسی دڵ دەکات؟

لەبەر ئەوەی دڵ جیاکەرەوەی ئەهلی کوفرو ئەهلی ئیسلامە، هەروەها جیاکەرەوەی ئەهلی ئیمان و ئەهلی نیفاقە، ئەگەرنا بە عەقڵ، جاری وا هەیە کافریش هەق دەناسێ، بەڵام دانی پێدا ناهێنێ، بە زمانیش، جاری وا هەیە ئەو ئینسانە لە ترسان ناتوانێ ئیمانەکەی دەرببڕێ، یاخود توانای دەربڕینی نیە، بە ئەندامەکانیش، ڕەنگە هەموو جارێ، ئەو ئەرکانەی بۆ جێبەجێ نەکرێن، بەڵام دڵ هەمیشە هەیە، تاکو ئەو ئینسانە لە ژیاندا بێ، بۆیە خوای کارزان لەباسی ئەو کەسانەدا کە بەزۆریی کوفریان پێ دەکرێ، دەفەرمووێ:

﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّ ﴿١٠٦﴾﴾ النحل.

واتە: مەگەر کەسێك زۆریی لێ بکرێ و، دڵیشی بە ئیمان ئارام گرتوو بێ.

ئەم ئایەتە دەربارەی (عمار بن یاسر) خوا لەخۆی و باب و دایکی ڕازی بێ، دابەزی، کە باب و دایکی کوژران و، کافرەکان خەریك بوو ئەویش بکوژن، گوتیان: دەبێ کوفر بکەی، قسە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڵێی و، مەدحی پەرستراوەکانی ئێمە بکەی، ئەگەرنا دەتکوژین، ئەویش هەندێ قسەی گوتن، کە ئەوان ڕازی بن، دوایی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گریا، گوتی: من ئەوەم گوتوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: دڵت چۆنە؟ گوتی: ئارام گرتوویە بە ئیمان (مطمئن بالإيمان)، فەرمووی: ئەگەر دووبارە هاتنەوە، تۆش دووبارەی بکەوە، {مادام دڵەکەت پڕ لە ئیمان بێ، زەرەری نیە}[1].

---

(١) بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج٢ ص٤٢٣، أخرجه عبدالرزاق في تفسيره (٣٦٠/٢/١) وابن سعد في (الطبقات الكبرى) (٢٤٩/٣) والطبريفي (جامع البيان) (١٢٢/١٤) وأبو نعيم في (الحلية) (١٤٠/١)، والحاكم (٣٥٧/٢) وقال صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه ووافقه الذهبي.

وقال مؤلفا الإستيعاب: قلنا فيه نظر لوجوه.....

باسی
چوارەم

## بڕوادار (مؤمن) کێیە؟!

هەڵبەتە وەك لە سەرەتاوەش باسمان کرد: قورئان دەربارەی هەموو بنەڕەتەکانی ئیمان نوختەی خستۆتە سەر پیت و، بۆ پێغەمبەریشی (صلی الله علیه وسلم) بەجێنەهێشتوە، چونکە ئیمان بناغەی ئیسلام و مسوڵمانەتییە.

ئەم باسەش لەبەر تیشکی چەند ئایەتێکدا شیدەکەینەوە، تاکو بزانین ئیماندار کێیە؟

پێشتریش گوتمان: خوا سبحانه و تعالی لە قورئاندا پێناسەی تەجریدیی بۆ شتەکان نەکردوە، بەڵکو بەوە پێناسەی بڕوادارانمان بۆ دەکات، کە کەسانێکن، هەڵگری ئیمانن، بۆ وێنە:

١)- لە سووڕەتی (الأنفال) ئایەتەکانی (٢و٣و٤)دا، خوا عزوجل ئاوا پێناسەی بڕواداران دەکات:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾.

واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە: کاتێ یادی خوا دەکرێ، دڵیان ڕادەچڵەکێ و، کاتێك ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، ئیمانیان زیاد دەکات و، تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و لەوەی پێمان داون دەبەخشن، ئەوانە بەڕاستیی بڕوادارن، لەلایەن پەروەردگاریانەوە پلە بەرزەکان و لێبوردن و بژێوێکی پەسندیان هەیە.

٢)- لە سووڕەتی (الحجرات) ئایەتی ژمارە (١٥)دا، دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾.

واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە، دواییش هیچ دوو دڵییان نیەو، لە پێناوی خوا تێدەکۆشن بە سامان و گیانیان، ئا ئەوانە ڕاستن (کە بڕوایان هێناوە).

٣)- لە سووڕەتی (النور) ئایەتی (٥٢)دا، خوای پەروەردگار بەم شێوەیە باسی بڕواداران دەکات:

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾.

واتە: قسەی بڕواداران کاتێ بانگ بکرێن بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی کە دادوەرییان لەنێواندا بکات، هەر ئەوەیە کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین، هەر ئەوانەش سەرفرازن.

٤)- هەر لە سووڕەتی (النور) ئایەتی (٦٢)دا، دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ﴿٦٢﴾﴾.

واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن، کە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوەو، کاتێك لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەبن بۆ کارێکی کۆکەرەوە {کارێکی هەرەوەزیی کە پێویستیی بە هەمووان بێ} تاکو مۆڵەت وەرنەگرن، بەملاولادا ناچن.

کەواتە: ئیمانداران ئەوانەن کە وێڕای ئیمان بە خوا، دەبێ قیادەیەکیشیان هەبێ و، پابەندیش بن بەو قیادەیەوە، هەر ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن

٥)- لە سووڕەتی (الحجرات) ئایەتی ژمارە (١٠)دا، خوای تاك و پاك، گۆشەو لایەنێکی دیکەی پێناسەی ئیمانداران باس دەکات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ﴿١٠﴾ ﴾ الحجرات. واتە: تەنیا بڕواداران بران، یاخود بڕواداران تەنیا بران.

٦)- هەروەها لە ئایەتی (٦٠)ی (النساء)دا، خوای پەروەردگار، لایەکی دیکە لە پێناسەی بڕواداران باس دەکات، ئەویش ئەوەیە لەکاتێکدا ناکۆکییان دەبێ، بۆ چارەسەری ناکۆکییەکانی نێوانیان، تەنیا دادوەریی خۆیان دەبەنە لای خواو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ ﴾.

واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی! کە پێیان وایە {هەر لەبەر ئەوەی ویستوویانە دادوەریی خۆیان بەرنە لای تاغووت، خوا دەفەرموێ: پێیان وایە، (يَزْعُمُونَ) چونکە وشەی (زَعْم) بۆ خەیاڵ و درۆ بەکاردێ}[1] ئیمانیان هەیە بەوەی کە بۆتۆ نێرراوەتە خوارو بەوەش کە پێش تۆش نێرراوە، لەکاتێکدا کە دەشیانەوێ داوەریی خۆیان ببەنە لای تاغووت {طاغووت: هەر کەسێکە کە حوکم بە غەیری شەریعەتی خوا بکات} کە فەرمانیشیان پێکراوە کوفری پێ بکەن، شەیتانیش دەیەوێ زۆر دووریان بخاتەوەو گومڕایان بکات.

ئەمانە چەند لایەنێکی سەرەکیی پێناسەی مرۆڤی بڕوادار (مؤمن) بوون، کە بێگومان لایەنی دیکەشی هەن.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص٢٣٠، ط٢٠١٢/١م، المطبعة العصرية.

باسی
پێنجەم

## ئایا کردەوە بەشێکە لە ئیمان، یان نا؟

هەڵبەتە بەوەی کە پێشتر باسمان کرد، وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر باش هاتۆتە دەستمانەوە، کە بە تەئکید کردەوە بەشێکە لە ئیمان، کە بێگومان لێرەدا کردەوە (عمل) مەبەست پێی کردەوەی جەستەیە، یانی: کردەوەی ئەندامەکان.

زانایان لەسەر ئەوە مشت و مڕو کێشەیان بووە، زانایانی ئۆممەت لەو بوارەدا بە گشتیی بوونەتە سێ بەش:

**١)**- هەندێکیان کە دەگونجێ ناویان بنێین (المُفَرِّطون)، واتە: زایە کەران، کەمتەرخەمان، کە جەهمییەو مورجیئەن، ئەوانە گوتوویانە: کردەوە پێکهێنەری ئیمان نیەو، دەگونجێ ئینسان هیچ کردەوەیەکی نەبێ و هیچ پابەندییەکی بە شەریعەتەوە نەبێ و، ئیمانداریش بێ!

**٢)**- (المُفْرِطون) تێپەڕێنەران، زێدەڕۆییکەران، کە خەواریج و موعتەزیلەن و پێشتریش باسمان کردوون، گوتوویانە: هەموو کردەوەیەك پێکهێنەری ئیمانە کەواتە: ئینسان هەر واجبێکی شەرعیی بچوێنێ، پێی کافر دەبێ و، هەر گوناهێکیش بکات، پێی کافر دەبێ، ئەوانەش تێیان پەڕاندوە.

٣- (المُتوسِّطون) ئەوانەی کە خەتی نێوەڕاستیان گرتوە، کە زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی ئیسلام و زانایانی ئۆممەتن، گوتوویانە: جینسی کردەوە، بەشێکی ئیمانە، ئنجا یان پێکهێنەر (مكوِّن)یەتی، یاخود تەواوکەر (مُكمِّل)یەتی، چونکە ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ و، هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن: کردەوە تەواوکەری ئیمانە، بەڵام پێکهێنەری نیە، هەڵبەتە ڕای ڕاست ئەوەیە کە کردەوە {هەموو کردەوەیەك نا} بەڵام جینسی کردەوە، پێکهێنەری ئیمانە، چونکە وەك پێشتریش باسمان کرد: خوا پابەندیی بە شەریعەتەوەشی ناوناوە ئیمان و، نوێژیشی ناوناوە ئیمان.

ئنجا زانایان مشت و مڕی زۆریان هەبووە لەو بارەوە کە ئایا کەسێك هەر نوێژ نەکات، بە ئیماندار لەقەڵەم دەدرێ، یان نا؟! پێشتر لەسەردەمی هاوەڵان و لەسەردەمی تابیعییندا، عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەگێڕێتەوە دەڵێ: {كَانَ أَصْحَابُ محَمَّدٍ صلى الله عليه وسلم لا يَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ، غَيْرَ الصَّلاَةِ} أخرجه الترمذي برقم: (٢٦٢٢)، قال الألباني في سنن الترمذي: صحيح.

عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، واز هێنان لە هیچ کردەوەیەکیان، بە کوفر لەقەڵەم نەداوە، جگە لە نوێژ.

یانی: نوێژ کەسێك نەیکردبێ، خاوەنەکەیان بە کافر لەقەڵەم داوە، بەڵام وەك ئەمانەتی زانستیی پێویستە ئەوە بڵێم کە زۆربەی زانایان لە چوار مەزهەبەکان (ئەبو حەنیفەو، مالیك و، شافیعیی)، هەر سێکیان ڕایان وایە: کەسێك کە نوێژ نەکات لەبەر تەنبەڵیی، هەر بە مسوڵمان لەقەڵەم دەدرێ، بەڵام تاوانێکی کردوە، ئنجا ئایا سزایەکەی چییە؟ هەندێ گوتوویانە: دەکوژرێ، هەندێ گوتوویانە: سزا دەدرێ، هەندێ گوتوویانە: حەپس دەکرێ، بەڵام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕای وایە: ئەو کەسەی کە لە بناغەدا نوێژ نەکا، بە ئیماندار دانانرێ.

شایانی باسە من لەمەوسووعەی: {خوا پەرستیی ئیسلامیی} لە کتێبی دووەمدا بە دوورو درێژیی لەو بارەوە دواوم و، قسەی زانایانیشم هێناوەو پێم وایە

ئەو مەسەلەیە دەبێ وردە کاریی تێدا بکرێ، بۆ وێنە: (إبن تیمیة) قسەیەکی هەیە دەڵێ: {کەسێ هەر تەنها نوێژەکانی جومعەش بکات، ناتوانین بڵێین: کافرە، چونکە ئەگەر تەنیا جومعەش بکات، مانای وایە ئەهلی قیبلەیە، ئەهلی سەجدەیە، ئەهلی نوێژە، بەڵام کەسێك کە هیچ نوێژان نەکات، لەوێدا ئیشکال دروست دەبێ}[1].

منیش پێم وایە ئەو مەسەلەیە لەڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژگارێك، فەرق دەکات، لەشوێنێك کە خەڵك تێگەیەنراوە کە مرۆڤ ئەگەر نوێژ نەکات، کردەوەکەی بە کوفر لەقەڵەم دەدرێ، ئەوە جیایە لە شوێنێك کە ئەو جۆرە هۆشیاریی و شارەزاییە نەبێ و، ئەو کەسە ئەو قەناعەتەی نەبێ، وەك زۆر لە خەڵکی لەنێو گەلی کوردی خۆماندا، پێی وا نیە، کە کەسێك نوێژێ نەکات، پێی کافر دەبێ! پێم وایە کەسی وا تاکو بەڵگەی لەسەر تەواو نەکرێ و، بیانوو بڕاو نەکرێ، چاك چاك تێنەگەیەنرێ، دروست نیە ئەو ڕایەی بەسەردا بسەپێنرێ، کە نوێژ نەکەر بە ڕەهایی بە کافر لەقەڵەم دەدرێ، چونکە ئەوە دوایی زۆر حوکمی جۆراو جۆری دێنە سەرێ: ئەگەر هاوسەری هەبێ و مسوڵمان بێ، نیکاحەکەی هەڵدەوەشێتەوە، منداڵەکان لەڕووی نەسەبەوە ئیشکالیان تێ دەکەوێ، هەروەها میراتگرتن و بە خاك سپاردن و زۆر شتی دیکەش، ئنجا من ئەو ڕایەم پێ ڕاستە، کە دەبێ، لەوەدا وردبینیی بکرێ و پەلە نەکرێ و، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك، ئەو حوکمە فەرق دەکات، ئەگەرنا کاتێك ئینسان تەماشای قورئان و ئەو هەموو فەرموودانە دەکات دەربارەی نوێژ، دەگاتە ئەو ڕایە کە کەسێك هەر نوێژ نەکات، بە مسوڵمان لەقەڵەم نادرێ:

---

(١) خوا پەرستیی ئیسلامیی، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ١٠٩-١٥٣، چاپی ٢/ ٢٠٠٩ز، هەروەها بڕوانە: مجموع الفتاوى، لابن تيمية، ج٦ ص٤٢٩و، ج٧ ص٧١٦و، ج٢٤ص٢٨٧.
شایانی باسیشە (إبن تیمیة) لەبارەی حوکمی بابای نوێژنەکەرەوە بە بیانووی تەنبەڵییەوە گوتوویەتی: {وأكثر السّلف على أنه يُقتَلُ كافراً} مجموع الفتاوى، ج٢٨ ص ٣٠٨.
کەچی (النووي)ش دەڵێ: {فمن ترك الصلاة تكاسلاً... أنه يُقتَلُ حَداً ولا يُكفَّرُ، وبه قال مالك والأكثرون من السلف والخلف، وقالت طائفة: يكَفَّرُ ويجري عليه أحكام المرتدين في كل شيء} المجموع شرح المهذب، ج٣ ص١٧.

بۆ نموونە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصْحَٰبَ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِى جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ ٱلْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾ المدثر.

واتە: هەر كەس بارمتەی ئەوەیە كە كردوویەتی (لە دۆزەخدا حەپس دەكرێ) جگە لە هاوەڵانی دەستە ڕاست، لە چەند باغێك دان، لە تاوانباران دەپرسن: چ شتێك ئێوەی خستە كڵپەی ئاگری دۆزەخەوە؟ گوتیان: ئێمە لە نوێژكەران نەبووین و، خواردنمان نەدەدایە نەدارو، لەگەڵ بێبڕوایان دەڕژاینە نێو قسەی خراپەوەو، بڕواشمان بە ڕۆژی سزاو پاداشت نەبوو، هەتا مردنمان گەیشتە سەر.

ئنجا هەرچەندە هەندێ لە توێژەرەوان دەڵێن: بە كۆی ئەو چوار شتە، تووشی دۆزەخ بوون و بە ئەهلی كوفر لەقەڵەم دراون، نەك بە تاك تاكیان، بەڵام گرنگ ئەوەیە یەكەم سیفەتیان ئەوەیە: (لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ) لە نوێژ كەران نەبووین، بۆیە تووشی ئێرە بووین.

٢- هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ﴾ القیامة.

واتە: (ئەو دۆزەخییە) بەڕاستی نەزانیوە (ئیسلام یان قورئان، یان پێغەمبەر) و نوێژیشی نەكردوە، بەڵكو بەدرۆی داناوەو پشتی هەڵكردوە.

٣- هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ۗ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ ﴾ التوبە.

واتە: ئنجا ئەگەر گەڕانەوەو نوێژیان بەرپا كردو زەكاتیان دا، ئەوە برای دینییتانن و، ئایەتەكانیش بۆ كۆمەڵێك بزانن ڕوون دەكەینەوە.

واتە: ئەگەر وا نەکەن، برای دینییتان نین، چونکە هەندێ لە زانایان گوتوویانە: چوار پایەکان: (نوێژ، زەکات، ڕۆژوو، حەج) هەر کامێکیان واز لێهێنانی بەیەکجاریی، کوفرە، بەڵام زۆربەیان هاتوونە سەر نوێژو، هەندێکیش لەسەر زەکاتیش ڕایان وایە.

٤- هەروەها ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێ: {الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلَاةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم: (٣٠٣٩٦)، وأحمد برقم (٢٢٩٨٧)، والترمذي برقم (٢٦٢١)، وقال: حسن صحيح غريب، والنسائي برقم (٤٦٣)، وابن ماجه برقم (١٠٧٩)، وابن حبان برقم (١٤٥٤)، والحاكم برقم (١١)، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي برقم (٦٢٩١)، وأخرجه أيضا: الدارقطني (٥٢/٢)، والديلمي برقم (٤٢٥٧)، والمروزي في تعظيم قدر الصلاة برقم (٨٩٦)، وعبد الله بن أحمد في السنة برقم (٧٦٩)، قال المناوي (٣٩٥/٤): قال العراقي في أماليه: حديث صحيح، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي، وقال الألباني: صحيح.

واتە: ئەو پەیمانەی لەنێوان ئێمەو ئەواندا هەیە، نوێژە، هەرکەسێ نوێژ نەکا کافرە.

٥- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ، تَرْكُ الصَّلَاةِ} أخرجه مسلم برقم (٨٢)، وأبو داود برقم (٤٦٧٨)، والترمذي برقم (٢٦١٩) وقال:حسن صحيح، وابن ماجه برقم (١٠٧٨)، والبيهقي برقم (٦٢٨٧).

واتە: لەنێوان پیاوو شیرك و کوفردا، وازلێهێنانی نوێژە، یانی: هەر کەسێ وازی لە نوێژان هێنا ئەوە لە بازنەی ئیسلام دەرچووە.

مەبەستم ئەوەیە دەقەکان زۆر زۆرن لەو بارەوە، بەڵام ئینسان زیاتر لای ڕەحمەت و دووربینیی بگرێ، باشترە.

باسی
شەشەم

## پلـەکانی ئیمـان

پێویستە بزانرێ کە:

ئیمان یەك پلە نیە، بەلای کەمەوە ئیمان سێ پلەی هەن:

**پلەی یەکەم:**

ئیمانی سەرەتا، ئەصڵی ئیمان (مطلق الإيمان، أصل الإيمان): ئەویش بریتیە لەلای کەمی ئیمان، لای کەمی ئیمانیش ئەوەیە کە ئینسان پێی دەبێتە بڕوادار، پێی دەبێتە مسوڵمان، لە لای خەڵکی و لەلای خوا.

**پلەی دووەم:**

ئیمانی پێویست (الإيمان الواجب): ئەویش ئەو ئیمانەیە کە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لە گوناهی گەورە، گوناهی گەورەش یان چواندنی واجبێکە، یاخود شکاندنی قەدەغەیەکە، بۆ نموونە: نوێژ نەکردن گوناهی گەورەیە، هەروەها زەکات نەدان، ڕۆژوو نەگرتن، هەروەك هەرکام لە: قەتڵ، زینا، دزیی، غەیبەت، درۆ، گوناهی گەورەن، چونکە هەرکامیان یان سزای دنیایی، یان هەڕەشەی

دوارۆژیی (عقوبة دنيوية أو وعيد أخروي)ی لەسەرە[1].

پلەی سێیەم:

ئیمانی پەسند، ئیمانی ڕەها (الإيمان المستحب، الإيمان المطلق): ئەویش ئەو ئیمانەیە کە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لە گوناهە بچووکەکانیش و، خاوەنەکەی وا لێ دەکات ببێتە بەندەیەکی چاك و بۆ خوا صوڵحاوو ئیمان دامەزراو.

بەڵێ ئیمان بەتەئکید یەك پلە نییەو، بگرە لەنێوان ئەو سێ پلە سەرەکییەشدا، پلەی زۆر هەن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات کە ئیمانێکی باش بێنین، هەمیشە ئیمانەکەمان گەرم و گوڕ بێ دامەزراو بێ، کە دیارە ئیمان بە تاعەت زیاد دەکات و، بەگوناح کەم دەکات، وەك چۆن چرایەك ئەگەر نەوتی تێدا بێ، ئەو چرایانەی کە بەنەوت دادەگیرسێن، هەتا نەوتی تێدا بێ، فتیلەکەی شوعلەو شۆقی هەیە، بەڵام کە نەوتی تێدا نەما، پڵیتەکەی دەسووتێ، ئیمانیش بە تەئکید بە تاعەت زیاد دەکات و، بێگومان بە گوناح کردن کەم دەکات، فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) ئەوە دەگەیەنن، بۆ وێنە: لە فەرمایشتێکدا هاتوە[2] ئەوەی زینا دەکات، یان دزیی دەکات، یان شەڕاب دەخواتەوە، ئیمانی نیە لەو کاتەدا، واتە: ئیمانێکی وای نیە لەو گوناهەی بگێڕێتەوە، یانی ئیمانی تەواوی نیە.

---

(١) زۆربەی هەرە زۆری زانایان گوناهی گەورە (الكبيرة)یان وا پێناسە کردوە کە: {هەر گوناهێکە سزای دنیایی یان هەڕەشەی قیامەتی لەسەر بێ}

{الكبائر جمع كبيرة قال الراغب: وهي متعارفة في كل ذنب تعظم عقوبته وفي الإصطلاح: هي ما كان حراماً مَحْضاً شرعت عليه عقوبة محضة، بنص قاطعٍ في الدنيا والآخرة:

وقيل: إنها ما يترتب عليها حدٌّ أو توعُّدٌ عليها بالنار أو اللعنة أو الغضب} **معجمم المصطلحات والألفاظ الفقهية، د. محمود عبدالرحمن عبدالمنعم، ج٣ ص ١٣٥.**

(٢) ئەمەش دەقی ئەو فەرمایشتەیە: {لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَشْرَبُ الْخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَنْتَهِبُ نُهْبَةً يَرْفَعُ النَّاسُ إِلَيْهِ فِيهَا أَبْصَارَهُمْ حِينَ يَنْتَهِبُهَا، وَهُوَ مُؤْمِنٌ} أخرجه البخاري برقم (٦٨٢٥)، ومسلم برقم (٥٧)، والنسائي برقم: (٤٨٨٦).

## بەرایی

خوێنەری بەڕێز!

لەم بەشی سێیەمەدا پایەی سێیەمی بیرکردنەوەی ئیسلامیی دەتوێژینەوە، کە بریتیە لە تێڕوانینەکان (التصورات) دیارە مەبەستیشمان تێڕوانینە ئیسلامییەکانە.

کە سەرجەم چواردە (١٤) تێڕوانینی جووتن، دوو دوو بە جووتە دەیانهێنین و، هەر کام لەو حەوت جووتە تێڕوانینەش، کە حەوت بواری سەرەکیی دەگرنەوە، لە باسێکی سەربەخۆدا دەتوێژینەوە:

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە: وەك چۆن ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەسەر بناغەی {بووناسیی ئیسلامیی} دادەمەزرێ، تێڕوانینەکانیش بۆ ژیان و، مردن، بۆ دنیاو دوارۆژ، ...هتد، هەموویان هەڵقوڵاوی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیین، هەڵبەتە پەیوەستیش دەبنەوە بە بووناسییەوە، بەڵام زیاتر لە کانی و سەرچاوەی ئیمان و عەقیدەوە هەڵدەقوڵێن.

ئاشکراشە تێڕوانینەکانی ئیسلام زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە هەوڵمان داوە لە حەوت بواردا، باسی چواردە (١٤) جۆریان بکەین، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

١- ژیان و مردن.
٢- دنیاو دوارۆژ.
٣- عەقڵ و زانست.
٤- دەوڵەمەندیی و هەژاریی.
٥- پێشکەوتن و دواکەوتن.
٦- ئینتیما بۆ گەل و سەرپێیبوون (ولاء) بۆ ئۆممەت.
٧- بەختەوەریی و ژینتاڵیی.

باسی
یەکەم

# ژیـان و مـردن

ژیان و مردن دژو پێچەوانەی یەکدین و، دوو دیاردەو حاڵەتی گەورە گرنگی مرۆڤـن، ئنجا ئایا تێڕوانینی ئیسلامیی بۆ ئەو دوو دیاردەیە چۆنە؟

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە وا تەماشای ژیان و مردن دەکرێ، کە دوو دیاردەن خوا سبحانە و تعالی هێناونیە دی و، پێویستی کردوون لەسەر بەشەرو، لەسەر جینیش، ئەگەرنا فریشتەکان ئەوەندەی ئێمە بزانین مردنیان بەسەردا نایەت، مەگەر لەکاتی ئاخیر زەماندا، بەڵام ئەوەی بەتەئکید هەم دەژی و هەم دەمرێ، مرۆڤە، هەروەها جینیش، وەك چۆن شەوو ڕۆژ بەسەر خڕۆکەی زەویدا دێن، بەهەمان شێوە مەرگ و مردنیش بەسەر مرۆڤ و جندا دێن.

دیارە خوا عز وجل لە زۆر ئایەتاندا باسی ئەو بابەتەی کردوە، بۆ نموونە:

١- خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ۝١ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾ الملك.

واتە: بەرزیی و پایەداریی بۆ زاتێك كە موڵكی بەدەستەو لەسەر هەموو شتێكیش بە توانایە، ئەو كەسەی كە مەرگ و ژیانی هێناونە دی، تاكو تاقیتان بكاتەوە: كامەتان كردەوەی باشترەو، ئەو زاڵی لێبوردەیە.

ئنجا زانایان لەو بارەوە زۆر قسەو باسیان كردوە كە: ئەوە دەزانین ژیان دروستكراوە، بەڵام مردن كە شتێكی نەبوویی (عَدَمي)یە، چۆن خوا باسی مردنیشی كردوە كە خوڵقاندوویەتی و هێناویەتە دی؟

وەڵامەكەی ئەوەیە كە وەك چۆن ژیان لەسەر مرۆڤ دێتە دی، مەرگیش بە هەمان شێوە، مەرگیش حاڵەتێكە كە بریتیە لە جیابوونەوەی ڕووح لە جەستە، ئەوەش شتێكی بوویی (وجودي)یەو بوونێكی هەیە، كەواتە: ڕووح لە جەستە دەچێتە دەر، ئەگەرنا مردن بریتی نیە لە لەبەین چوون، ئەوە هەم لە ڕوانگەی ئەهلی ئیسلامەوەو، هەم لە ڕوانگەی هەموو شەریعەتە ئاسمانییەكانەوە، بەڵام ئەوە ئەهلی ئیلحادن كە پێیان وایە: مردن بریتیە لە لەبەین چوون، وەك یەكێكیان گوتوویەتی: {أرحام تدفع، وقبور تبلع}، منداڵدان منداڵیان دەبن و، گۆڕەكانیش قووتیان دەدەن و، تەواو كۆتایی دێ! بەڵام ئێمە دەڵێین: بە دڵنیایی ئەوە ڕاست نیە، بەڵكو مەرگ بریتیە لە جیابوونەوەی ڕووح لە جەستە، ڕووحێك كە تاكو ئێستا لەنێو ئەو جەستەیەدا بووە، ئنجا دەچێتە قۆناغێكی دیكەوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە، تاكو ڕۆژێك كە تێیان زیندوو دەكرێنەوە.

زانایان كە ناویان لەو قۆناغەی دوای مەرگ ناوە: ژیانی بەرزەخ، لەو ئایەتەوە وەریان گرتوە، قۆناغی بەرزەخیش قۆناغێكی ڕاگوزەر (مرحلة انتقالية)ە، چونكە خوا دەفەرموێ: (وَمِن وَرَآئِهِم) واتە: دوای ئەوەی كە دەمرن، (بَرۡزَخٌ) یانی: پەردە، وەك چۆن لە سووڕەتی (الرحمن)دا باسی ئاوی شیرین و سوێر دەكات، دەفەرموێ:

﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ ﴾ الرحمن، {هەر وشەیەك لە قورئاندا، ئەگەر لە شوێنێکدا لە واتایەکەی تێنەگەیشتن، بگەڕێن لە قورئاندا لە شوێنێکی دیکەدا بەکار هاتووەو مانایەکەی ڕوون دەبێتەوە}.

واتە: (خوا) دوو دەریایەکانی تێکەڵ کردوون، پێك دەگەن، بەڵام لە بەینیاندا پەردەیەك (نێوانێك) هەیە، هیچ کامیان بەسەر ئەوی دیکەیاندا زاڵ نابێ و تێکەڵ نابن.

هەمیشە ئاستی ئاوی شیرین بەرزترە لە ئاستی ئاوی سوێر، ئاوی سوێر بەسەر ئاوی شیریندا زاڵ نابێ، ئاوی شیرینیش دوای ئەوەی کە مرۆڤ پێویستیی پێنامێنێ، تێکەڵ بە ئاوە سوێرەکان دەبێتەوەو ئەوەش زیانی نیە.

﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾ المؤمنون.

واتە: لە پشتیانەوە پەردەیەك هەیە تاکو ئەو ڕۆژەی کە زیندوو دەکرێنەوە، کەواتە: ژیانی بەرزەخ قۆناغێکی ڕاگوزەرو کاتییە، ئنجا دیارە هەر لەدوای مردنەوە، مرۆڤ لەخۆی حاڵی دەبێ، قسەیەکی زۆر بەجێیە کە دەگوترێ: هەرکەسێ مرد قیامەتی ئەو داهاتوە (من مات فقد قامت قيامته)، ڕۆژێ یەکێ پرسیاری لێ کردم گوتی: سزای گۆڕو، نیعمەتی گۆڕ، دواییش قیامەت و چوونە بەهەشت و دۆزەخ، یانی چیی؟[1] وەڵامەکەی ئەوەیە کە بێگومان ئەو سزا یان نیعمەتە، کە لەدوای مردنەوە دەست پێ دەکات، شتێکی کاتییەو لەقەدەر ئەو قۆناغەیە، وەك چۆن نیعمەتەکانی دنیا لەچاو بەهەشت، هەر هیچ نین، ئازاری دنیاش بەهەمان شێوە، وەك لە فەرموودەدا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ئاگرەکەی ئێوە، بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! (صلی الله علیه وسلم) هەر ئەم ئاگرەش بەس بوو بۆ سزادان! فەرمووی: ئاگری دۆزەخ شەست و نۆ هێندەی دیکەش گەرمە[2].

---

(١) مەبەستی ئەوەبوو کە ئایا: ئازارو نیعمەتی قۆناغی بەرزەخ، لەگەڵ سزاو ئازارو نازو نیعمەتی نێو دۆزەخ و بەهەشتدا، دژ ناوەستێ؟!

(٢) أخرجه أحمد برقم (١٠٢٠٤)، والبخاري برقم (٣٠٩٢)، ومسلم برقم (٢٨٤٣).

ئنجا من پێم وایە ئەو ژمارەی حەفتا (٧٠)یەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەر بۆ حاڵی کردنی هاوەڵانی بووە، ئەگەرنا مەرج نیە تەنیا حەفتاش بێ، چونکە ئێستا دیوی دەرەوەی خۆر هەزاران پلەی فەهرەنهایت گەرمەو، نێوەوەی خۆر ملیۆنان پلە گەرمە، یانی: لەگەڵ ئاگردا هەر قیاس ناکرێ، دۆزەخیش بەس خوا دەزانێ چەند گەرمە، بەتایبەتیش وەك لە فەرمایشتەکاندا هاتوە: جەستەی کافران زۆر گەورەو زەبەلاح دەبێ، دیارە پێویستی بە سزایەکی بەتینیش دەکات.

کەواتە: نیعمەتەکان و سزایەکانی دنیا، لەقەددەر ئەو لاشەیەی ئێستامان و لەقەددەر ئەم قۆناغەن و، هی بەرزەخیش لەقەددەر بەرزەخن و، هی قیامەتیش لەقەددەر قیامەتن.

ئنجا پێشتریش باسمان کرد -بۆیە ئێستا زۆر لەسەر ئەوە ناڕۆم- کە ئەم بوون (وجود)ە، هەمووی پەیوەستە بە ژیانی مرۆڤەوە، وەك خوای کارزان دەفەرموێ:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ ﴾ هود.

واتە: وە ئەو (خوا) ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی و بارەگایەکەشی لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامتان کردەوەی باشترە! ئەگەر بشڵێی: بە دڵنیایی دوای مردن زیندوو دەکرێنەوە، ئەوانەی بێبڕوان بە جەختکردنەوە دەڵێن: ئەمە تەنیا جادوویەکی ڕوونە.

(لِيَبْلُوَكُمْ ) ئەو (لام)ە هی (تعلیل)ە، واتە: خوا تاکو ئێوە تاقی بکاتەوە، ئەم حەوت ئاسمان و زەوییەی لە شەش قۆناغاندا دروست کردن و، عەرشەکەشی لەسەر ئاو بوو[1].

---

(١) لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا بە تەفصیڵ تەفسیری ئەو ئایەتەم کردوە، لێرە شوێنی ئەوە نیە بچمە نێو وردەکارییەکانیەوە.

باسی
دووەم

## دنیـــاو دوا ڕۆژ

پێشتر باسمان کرد: ژیانی دنیا یانی: ژیانی نیزیك و (آخرة)ش یانی: دوور، ژیانی دنیا بە دوو ئیعتیبار تەماشا دەکرێ:

**یەکەم:** لەڕووە ماددییەکەیەوە {نازو نیعمەتەکانی}و، لەو ڕووەوە کە ژیانێکی زۆر کاتییەو، لەو ڕووەوە کە پڕە لە ناڕەحەتیی و گرفتاریی، تەنانەت بۆ کەسانێکی کە خۆشیان یەکلا دەکەنەوە بۆ وەرگرتنی لەززەت لە ژیانی دنیا، لەو ڕووەوە: ژیانی دنیا زۆر کەم بایەخ و بچووکەو شتێکی نابووتە، بۆیەش لە ئایەتەکاندا شوبهێنراوە بە گەمەو یاریی منداڵانەوە.

**دووەم:** بەڵام لەو ڕووەوە کە شوێنی تێدا تاقی کرانەوەیەو، شوێنی ئەوەیە کە ئینسان بڕوانامەیەکی تێدا وەربگرێ بۆ چوونە بەهەشت، یاخود بڕوانامەیەك کە پێی لە دۆزەخدا نیشتەجێ بێ! ئەوە بەڕاستی هەتا بڵێی قۆناغێکی هەستیارەو ژیانێکی مەترسیدارەو جێگای گرنگیی و بایەخە.

کەواتە: هەموو ئەو ئایەتانەی کە باسی ژیانی دنیا دەکەن، کە شتێکی بچووکەو کەم بایەخەو دەبێ ئینسان نەفریوێنێ، مەبەست پێی لایەنە ماددییەکەیەتی،

هەروەها ئەو ئایەتانەی دیکەش کە باسی ژیانی دنیا دەکەن کە: ئاگاتان لەخۆتان بێ و وریا بن! ئەوە بەو ئیعتیبارەیەتی کە ئێمە لە ژیانی دنیادا تاقی دەکرێینەوەو، ژیانی دوا ڕۆژیشمان پەیوەستە بە ژیانی دنیاوە، من زۆرجار لەبەر خۆمەوە ڕادەمێنم و بیر دەکەمەوە، دەڵێم: ئەگەر ئینسان پێنج شەش ژیانی هەبوونایە، یەکێکی بەس بۆ ئەزموون بەکارهێنابایەو، ژیانێکی دیکەی بۆ شتێکی دی و، ...هتد، بەڵام یەك ژیانەو زیاتر نیە، ئنجا کۆتایی ئەو یەکجار ژیانەش، نازانێ کەیە!

ڕەنگە جار جار ئینسان وەسوەسەیەکی شەیتانیی بۆ بێ: ئایا ئەوەندە ژیانە کەی بەشی ئەوە دەکات مرۆڤ تێیدا تاقی بکرێتەوە؟ بەڵام نا، خوای پەروەردگار کاربەجێیە، بە ئێمە دەفەرموێ:

﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ ﴿٣٧﴾﴾ فاطر.

واتە: ئایا بایی ئەوەندە نەمژیاندن {تەنیا ئەم ئایەتە لە قورئاندا بەم شێوەیە هاتوە} کەسێك ئەگەر ویستبای بیری بکەوێتەوە، بیری دەکەوتەوە؟! {واتە: پەروەردگارێتیی خواو بەندایەتیی خۆی بیردەکەوتەوە}.

کەواتە: ئەم ژیانی دنیایە بایی ئەوەندە دەکات، کە ئینسان تێیدا خۆی بناسێ و خوا بناسێ، چاك و خراپ و حەڵاڵ و حەرام لێك جیا بکاتەوە.

لێرەدا پرسیارێکی دیکە دێتە پێش: باشە ئەوە ئێمەی ئەهلی ئیسلام زانیمان، خوا ئێمەی لە نیعمەتی ئیمان و ئیسلام و قورئان و سوننەت بەهرەمەند کردوە، بەڵام ئەدی ئەو خەڵکەی دیکەی دنیا، هەیانە هەر دەنگ و باسی ئیسلامی پێ نەگەیشتوە، ئەوانە حوکمیان چییە؟ ئایا هەموویان یەکسەر ڕێ بۆ جەهەننەم؟! ئەوەی من تێیگەیشتووم بەو شێوەیە نیە، کە ئەو خەڵکە هەمووی دۆزەخیی بێ، بۆچی؟

لە سوورەتی (الإسراء)دا خوا سبحانە و تعالى دەفەرموێ:

﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾﴾

واتە: ئێمە سزادەر نین، تاکو پێغەمبەر نەنێرین.

پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ ئەرکیان چی بووە؟ ﴿فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ۝٣٥﴾ النحل.

واتە: ئایا پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، جگە لە گەیاندنی ڕوون و ئاشکرا، یان ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەر، چیدیکەیان لەسەر بووە؟

من زۆر گەڕاوم بە وڵاتاندا: خەڵکم بینیوە ئەصڵەن دەنگ و باسی ئیسلامی نەبیستوە، یاخود کە بیستووشیەتی سەرەو بن و لینگەو قووچ بیستوویەتی، بۆ وێنە: باسی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بیستووە، بەڵام بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئێمە پێغەمبەری خۆمان دەناسین، هەروەها باسی قورئانی بیستوە، بەڵام پێچەوانەی ئەوەوە کە ئێمە قورئان دەناسین، وەك کتێبێکی ئەفسانەیی، باسی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بیستوە، وەك بابایەکی شەڕانگێزو بە وەسفی دیکەی نالایەق!

ئنجا ڕۆژی دوایی بابایەکی ئاوا، ئەگەر خوا لێی بپێچێتەوە دەڵێ: خوایە! من باسی ئیسلامم بیستبوو، بەڵام ئاوام بیستبوو، پێچەوانەی ئەوە کە تۆ ناردووتە، ئنجا ئایا ئاوا ئیمانم پێ هێنابووایە؟! موحەممەدت (صلی الله علیه وسلم) ناردوە وەك ڕەحمەت بۆ جیهانییان، بەڵام من پێچەوانەی ئەوەم بیستبوو، قورئانم وا بیستبوو کە پڕە لە ئەفسانە!! هەڵبەتە ئەو بابەتە دەگونجێ قسەی دیکەی زۆری لەسەر بکرێ، بەڵام پێم وایە بەو شێوەیە نیە کە هەرچی ئەهلی ئیسلام نەبێ، هەمووی یەك ڕێ بۆ جەهەننەم بێ، چونکە خوا ستەم لەکەس ناکات، کەسێ هەوڵی دابێ بۆ گەیشتن بەهەق، بەڵام دەستی نەکەوتبێ و بۆی هەڵ نەکەوتبێ، لەبەر ئەوەی کەش و هەوایەکەی وابووە، لە هەندێ وڵاتی ڕۆژئاواییدا منداڵەکانی خۆیان هەر بە بچووکیی لەسەر ڕق هەڵسان لە ئیسلام پەروەردە دەکەن، ئیسلامیان لەلا بوغزێنراو دەکەن، یەکێ بۆی گێڕامەوە لە هەندێ وڵات {نەك هەموویان} لە باخچەی ساوایان، ژوورێك کە پڕە لە میوەی خۆش و خواردنی خۆش و لەسەری نووسراوە: ئایینی مەسیح، ئەو منداڵانە دەبەن بۆ ئەو ژوورەوەو دەڵێن: با بچین بۆ ئایینی مەسیح، ژوورێکیشیان بە

پێچەوانەی ئەوەوە پڕ کردوە لە شتی ناجۆرو پیس و لەسەریان نووسیوە: ئاییینی ئیسلام، ئنجا کە پێیان دەڵێن: بچین بۆ ژووری ئیسلام؟ دەڵێن: نەخێر.

گومانی تێدانیە ئەوە کاریگەریی خۆی هەیە، ئەو دیو هەست (لا شعوري) مرۆڤ، ئەو شتانە تۆمار دەکات، ئێستا شیعەکان کە هێندە لەخۆیان دەدەن و، هەر باسی (حسین) بکرێ، گریانیان دێ، ئەوە لەبەر ئەوەیە بە منداڵیی بە شیرەوە دەرخواردیان دەدرێ، هەیانە دەبێتە مولحیدو کافریش، کەچی بۆ حوسەینیش (خوا لێی ڕازی بێ) دەگری، چونکە بەمنداڵیی بە شیرەوە خواردوویەتی! ئنجا ئایا ئەوانە خوای کاربەجێ هەموویان وەك یەك حوکم دەدات؟ بێگومان نەخێر.

پاشان وشەی (کافر)، (إسم فاعل)ە، یانی: داپۆشەر (ساتر)، یانی: کەسێك کە هەقی پێگەیشتوەو شاردوویەتەوەو ڕەفزی کردوە، بەڵام کەسێ هەقی پێ نەگەیبێ، وشەی (کافر) نایگرێتەوە، چونکە هەقی پێ نەگەیشتوە، تاکو بیشارێتەوە، لەبەر ئەوە پێم وایە بەپێی ئەوە کە خوای متعال دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ ﴾ الإسراء.

هەروەها ئەو ئایەتەی دیکە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ فاطر.

واتە: هیچ کۆمەڵگایەك نیە، مەگەر ئاگادار کەرەوەیەکی تێدا ڕەوان کراوە، ئنجا ئەو ڕەوانە کراوە، ئەگەر دەنگی نەگەیشتبێتە ئەو خەڵکە، ئەو کاتە دیارە بەڵگەیان لەسەر تەواو نەکراوەو خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ:

﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء.

واتە: پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەر تاکو خەڵك دوای پێغەمبەران بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا، کەواتە: خەڵك ئەگەر پەیامی پێغەمبەرانیان پێ نەگات، بەڵگەیان دەبێ و بیانوویان دەبێ، لەڕۆژی دواییداو، هەرچەندە مسوڵمان نین، بەڵام کافریش نین و باشترین پێناسە بۆ ئەو جۆرە کەسانە ئەوەیە

کە پێیان بگوترێ: (فَتْرِي) واتە: کەسانێك کە لە ڕۆژگارێکدا ژیاون کە بە (فَترة) ناو دەبرێ واتە: پچڕانیی وەحیی و پێغەمبەرایەتیی، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩ ﴾ المائدة.

واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! ئەوە پێغەمبەرەکەمانتان بۆ هات، دوای دابڕانێك لە ناردنی پێغەمبەران، تاکو بیانووتان نەبێ بڵێن: هیچ موژدەدەرو ترسێنەرمان بۆ نەهاتوون، ئەوە موژدەدەرو ترسێنەرتان بۆ هات و، خواش لەسەر هەموو شتێك توانایە.

ئنجا بێگومان کەسانێك بێ ئەوەی کەمتەرخەم بووبن لە پەیام و بەرنامەی پێغەمبەری کۆتایی (محمد) (صلی الله علیه وسلم) حاڵی نەبووبن، حاڵیان وەك حاڵی ئەهلی فەترەیەو دیارە هەمان حوکمیشیان هەیەو، بەڵگەو بیانوویان بۆ قیامەتێ بەدەستەوەیە.

باسی
سێیەم

## عەقڵ و زانست

بە دڵنیایی: عەقڵ، زانست وەدەست دێنێ، ئنجا ئایا لە ئیسلامدا چۆن تەماشای هەر کام لە عەقڵ و زانست دەکرێ؟ بێگومان هیچ خاوەن دینێك نیەو، هیچ خاوەن بەرنامەیەك نیە، کە مەدحی عەقڵ و زانست نەکەن، هەموو میللەتان و گەلان ستایشی عەقڵ دەکەن و ستایشی زانست دەکەن، بە پێچەوانەوەش: نەفامیی (غباء) کە پێچەوانەی عەقڵە، زەمی دەکەن و، نەزانیی (جهل)یش کە پێچەوانەی زانستە، زەمی دەکەن.

ئنجا خوا سبحانە و تعالی لە قورئاندا زۆر مەدحی عاقڵان و زانایانی کردوە، بەڵکو خوا سبحانە و تعالی کەسێك کە زانیاریی هەبێ، بەڕاستێتیی ئایین و بەرنامەکەی، تەنیا ئەوی بە ئەهلی عیلم و عەقڵ و هۆشی داناوە، پێچەوانەکەشی بە کوێر داناوە، وەك لە سوورەتی (الرعد)دا دەفەرموێ:

﴿أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾﴾ الرعد.

واتە: ئایا کەسێك کە دەزانێ ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆتۆ نێرراوەتە خوار، هەقە، وەك کەسێك وایە کە کوێرە، بێگومان تەنیا خاوەن عەقڵان پەند وەردەگرن.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾ الزمر.

واتە: ئایا کەسێك کە ملکەچە بۆ خوا، لە کاتەکانی شەوگاردا، بە کڕنووش بردوویی و بەڕاوەستاویی و، مەترسیی ڕۆژی دوایی هەیەو، بەتەمای بەزەیی پەروەردگاریەتی {وەڵامەکەی قرتاو (محذوف)ە، یانی: ئایا کەسێکی ئاوا وەك کەسێکە غافڵ بێ لە خوا؟} بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن، یەکسانن؟ بێگومان تەنیا خاوەن عاقڵان پەند وەردەگرن.

مەگەر چۆن دەنا خوا لە قورئاندا، هەر کات باسی عیلمی کردبێ، باسی عەقڵیشی کردوە، چونکە لەڕێی عەقڵەوە عیلم پەیدا دەبێ، کەواتە: لە ئیسلامدا عەقڵ بە نیعمەتێکی زۆر گەورەی خوای پەروەردگار دانراوە، بەڵکو مرۆڤ بەهۆی عەقڵەوە، ئەرکی شەرعیی پێ سپێرراوەو، پێی دەسپێررێ، بۆیەش لەکاتێکدا مرۆڤ عەقڵی گەشەی نەکردبێ وەك منداڵ، یان لەدەستی بدات، وەك شێت و بێهۆش، یەکسەر تەکلیفی شەرعیی لەسەر لادەچێ.

ئاشکرایە خوای بێ وێنە بە عەقڵ وەسف ناکرێ، بەڵام بە زانیاریی (علم) وەصف دەکرێ، بەرهەم و ئەنجامی عەقڵیش بریتیە لە عیلم، خواش سبحانە و تعالی عیلمی هەیەو بە عیلم وەسف دەکرێ، هەروەها بە شارەزایی (خُبْرة)و بە حیکمەت وەسف دەکرێ، بەڵام بە عەقڵ وەسف ناکرێ، لەبەر ئەوەی عەقڵ پەیوەستە بە مێشك (دماغ)ەوە، ئنجا مرۆڤ هەتا عەقڵی نەبێ، ناتوانێ عیلمی هەبێ، بەڵام خوای کارزان سیفەتی عیلم و شارەزایی و حیکمەت و هەموو ئەو سیفەتانەی دیکەی هەن و، سیفەتەکانی خواش پەیوەست نین بە ئەندامانەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى.

واتە: هیچ شتێك وەك وێنەی وی نیەو، ئەو بیسەری بینەرە.

دەتوانین زۆر شت لەسەر گرنگیی عەقڵ و عیلم و تێڕوانینی ئیسلام لەو بارەوە، باس بکەین، بەڵام لێرەدا ئەوەندە بە بەس دەزانم، چونکە لە تەوەری دووەم و سێیەمدا، چەند جارێك قسەمان لەو بارەوە کردووە، لە تەوەرەی پێنجەمیشدا باسێکی تایبەت دەکەین دەربارەی پەیوەندیی نێوان عەقڵ و نەقڵ، بۆیە لێرە زۆری لەسەر ناچم، لەوێ بە پشتیوانیی خوا، هەقی خۆی دەدەینێ.

باسی
چوارەم

## دەوڵەمەندیی و هەژاریی

دەوڵەمەندیی (غِناءْ) ئەوەیە کە ئینسان سەروەت و سامانی هەبێ و، چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ، هەژاریی (فَقْر)یش پێچەوانەی ئەوەیەو بریتیە لە ئاتاجیی و پێویستیی مرۆڤ.

هەڵبەتە تێڕوانینی ئیسلامیی لەبارەی هەبوویی و نەبوونییەوە، جیاوازە لە تێڕوانینی غەیری ئیسلامیی، با بزانین چۆن؟!

هەوڵدەدەین لە دە (١٠) بڕگەی گوشراودا، تێڕوانینی ئیسلام لە بارەی دەوڵەمەندیی و هەژارییەوە، لە میانی دە (١٠) ڕاستیی دا، بخەینە ڕوو:

**١)**- لە ئیسلامدا سەروەت و سامان وەك وەسیلە تەماشا دەکرێ، نەك وەك ئامانج، هەروەها سەروەت و سامان وەك نیعمەتێکی خوا کە دەیبەخشێ بەبەندەکانی، تەماشا دەکرێ، نەك وەك شتێك کە مرۆڤەکان خۆیان پەیدای بکەن، بەبێ ئەوەی پەیوەست بێ بەویستی خوای پەروەردگارەوە.

٢)- دەوڵەمەندیی لە ئیسلامدا، پەیوەست نیە بەوەوە کە خوا سبحانه و تعالی لەو کەسە ڕازی بێ، کە دەوڵەمەندو ساماندارە، هەرچەندە سبحان الله! لەنێو مسوڵمانانیشدا زۆر جار ئەو بیرو بۆچوونە چەوتە هەیە، لە حاڵێکدا کە خوا ڕەخنەی پێ لە غەیری مسوڵمانان گرتوە! کەچی لەنێو مسوڵمانانیشدا زۆر جار کەسێك هەبوو (غني) بێ، پێی وایە خوا لێی ڕازییەو خۆشی دەوێ! بەڵام کەسێك نەدارو هەژار بێ، ئەگەر لەخۆی وریا نەبێ، شەیتان خوتخوتەو بیرۆکەو خەیاڵی خراپی دەخاتە دڵ و، پێی وایە خوا لێی تووڕەیە! کە بەدەقی ئایەت خوای زاناو توانا ئەو جۆرە بیر کردنەوەیەی ڕەت کردۆتەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

٣)- لە ئیسلامدا دەوڵەمەندیی بە نیعمەت دانراوەو، هەژاریی بە تاقیکردنەوە دانراوە، یانی: دەبێ بزانین دەوڵەمەندیی و سەروەت و سامان، ئەگەر بە حەڵاڵیی بێ، نیعمەتەو، دەبێ سوپاسی خوای لەسەر بکرێ، بەڵام هەژاریی تاقیکردنەوەیەو ناڕەحەتیی و گرفتارییەو، هەرگیز هەژاریی لە ئیسلامدا مەدح کراو (ممدوح) نیەو، لە هیچ ئایەتێکی قوڕئاندا خوا مەدحی هەژاریی و نەداریی نەکردوە، بەڵام مەدحی دەوڵەمەندانێکی کردوە کە سەروەت و سامانەکەیان لە ڕەزامەندیی خوادا بەکار دەهێنن، هەڵبەتە لەڕێی حەڵاڵەوە پەیدای دەکەن و، لەڕێی شەرعیی و حەڵاڵیشەوە بەکاری دەهێنن.

بۆ نموونە: با تەماشای ئەم سێ ئایەتە بکەین:

خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلْإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكْرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَكْرَمَنِ ﴿١٥﴾ وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبْتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّىٓ أَهَٰنَنِ ﴿١٦﴾ كَلَّا ﴿١٧﴾ ﴾ الفجر.

هەر جارێك وشەی ئینسان لە قوڕئاندا هات، بزانن مەبەست ئینسانێکە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیوەتێ، یانی: ئینسان کە بە ڕەهایی لە قوڕئاندا بەکاردێ، واتە: ئینسانێك خوا چۆنی دروستکردوە، ئاوا، بۆیەش مەگەر چۆن،

دەنا هەر کات وشەی (ئینسان) بەکار هاتبێ، لەگەڵ زەمدا هاتوە، چونکە مرۆڤ کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیشتێ و بەهرەمەند نەبوو لە هیدایەتی خوا، بەتەئکید بەڕێی ڕاست نازانێ و، بە ڕێگای چەوتدا دەڕواو تووشی خراپە دەبێ.

خوا دەفەرموێ: هەر کات پەروەردگاری مرۆڤ، تاقی کردەوەو ڕێزی لێ گرت و نیعمەتی پێدا {ڕێزی لێگرت، مەبەست پێی لایەنە ڕواڵەتییەکەیەتی، نەك بەو واتایەی لەلای خوا بەڕێز بێ، یانی: هەر کات نیعمەتی دایە (إنعام) ی لەگەڵ کرد} دەڵێ: پەروەردگارم! ڕێزی لێ گرتووم {بەو ئیعتیبارە ئەوە دەڵێ، کە خوا لە ڕووی مەعنەوییەوە ڕێزی لێ گرتوە، کەچی ئەو لەڕووی ماددییەوە، بەخششی پێ دراوەو خوا کەرەمی لەگەڵ نواندوە، بەڵام ئەو پێی وایە لەڕووی مەعنەوییەوە لەلای خوا بەڕێزو حورمەتە} بەڵام ئەگەر خوا تاقی بکاتەوەو، بژیوی لێ وەتەنگ بێنێ و کەم بکاتەوە، دەڵێ: پەروەردگارم منی بەکەم تەماشا کردوە، نەخێر وانیە.

٤)- دابەش کردنی ڕزق و ڕۆزییەکان و ئاستی ژیان، بەپێی ویستی خوا بەڕێوە دەچێ، بەڵام بەتەئکید لە میانی یاساکانی خوادا، کە ویستی مرۆڤەکان و هەوڵەکانیش کاریگەریی خۆیان هەیە، چونکە خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ ﴿٣٢﴾ ﴾ الزخرف.

واتە: ئێمە بژێوی ژیانی دنیامان بەسەردا دابەش کردوون و، هەندێکیانمان بەچەندان پلە بەسەر هەندێکیاندا بەرز کردۆتەوە، تاکو هەندێکیان هەندێکیان بەکار بێنن.

دیارە تەنیا دەوڵەمەند هەژار بەکار ناهێنێ، هەژاریش دەوڵەمەند بەکار دەهێنێ و، هەر حوکمڕان خەڵك بەکار ناهێنێ، خەڵکیش حوکمڕان بەکار دەهێنێ، یانی: تاکو هەموویان یەکدی بەکار بهێنن، بۆیە خوا ئاستەکانی ژیانی جۆراو جۆر کردوون.

لەزۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا، خوا ئەو حەقیقەتەی خستۆتە ڕوو، کە فراوان کردنی ڕزق و کەم کردنەوەی، ویستی ڕەهای خوای لەپشتە، بەڵام ئەوە تێکناگیریَ لەگەڵ ئەوەدا کە هەوڵی ئینسان دەور دەبینێ لەوەدا کە ڕزقی فراوان بێ و، تەمبەڵیی کردن و دانیشتنیشی، دەور دەبینێ لەوەدا کە ڕزقی لێوە تەنگ بێ، بەڵام هەرچۆن بێ، ویستی خوای پەروەردگار لەپشت ئەو هەقیقەتەوەیە.

٥)- جیاوازیی و بەرزیی و نزمیی لە ئاستەکانی ژیاندا، بۆ ئەوەیە کە دۆلابی ژیان بجووڵێ، ئایەتەکە دەفەرموێ: هەندێکیان هەندێکیان بەکار بێنن، نەیفەرمووە: {ويَسْخَر بعضُهم من بعض} هەندێکیان گاڵتە بە هەندێکیان بکەن! چونکە هەندێ وایان لێکداتەوە، کە لە ڕاستییدا تێی نەگەیشتوون.

ئنجا ژیانی دنیا لەلایەنە ماددییەکەیدا لەلای خوا، زۆر کەم بایەخە، بە ئەندازەیەك ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە خەڵك هەمووی کافر بێ، خوا بۆ بێبڕوایان، هەموو کەل و پەلێکی دەکردە زێڕو زیو، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ ﴿٣٣﴾ وَلِبُيُوتِهِمۡ أَبۡوَٰبٗا وَسُرُرًا عَلَيۡهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخۡرُفٗاۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الزخرف.

واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە خەڵك بەیەك کۆمەڵ هەمووی لەخوا عاسیَ بێ و بێ بڕوابێ، ئەوانەی کە بەرانبەر بەخوای بەبەزەیی، بێ بڕوان، وامان بۆ دەکردن: سەقفیماڵەکانیان و ئەو قاڵدرمەو پەیژانەی کە پێیاندا سەردەکەون، هەموویان لە زیو بن، هەروەها دەرگاکانی ماڵەکانیان و تەخت و قەنەفەکانی کە لەسەریان پاڵدەدەنەوە، هەموویان لە زێڕ بن...

یانی: خەڵکینە! ژیانی دنیا لە لای خوا زۆر بچووکەو کەم بایەخە، ئێوە فریوی پێ مەخۆن، ئنجا لەبەر ئەوە کە خەڵك یەکجاریی بە ژیانی دنیا هەڵنەخەڵەتێ، ئەگەرنا دنیا لەلای خوا ئەوەندە بێ بایەخە، ئەوانەی کە دوژمنی خوان، لە دنیادا کە بێ بڕوایانن، خوا بەو جۆرە دەوڵەمەندی دەکردن.

٦)- خوا عز وجل کە هەندێکان دەوڵەمەند دەکات و، هەندێکان هەژار دەکات، مانای وا نیە لە دەوڵەمەندەکان ڕازییەو لە هەژارەکان تووڕەیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، جاری وا هەیە وەك کوردەواریی خۆشمان ئەگەر کەسێك دەوڵەمەند بێت و، کاری چاکەشی لەسەر نەکات، دەڵێن: ماڵەکەی ماڵێکی بە غەزەبە، قسەکەیان زۆر جوانە: تۆ ماڵ و سامانێك کە نەبێتە هۆی ئەوەی پێ لە خوا نزیك ببیەوەو، خزمەتی خەڵك و وڵاتی پێ بکەی و، ڕەزامەندیی خوای پێ وەدەست بێنی، مانای وایە دەبێتە مایەی ئەوە کە تووڕەیی خوای پێ حاصڵ بکەی! هەروەها هەژارییەك کە ئینسان لەسەری خۆڕاگر بێ و، تووشی ناشوکریی نەکات و، بەهۆی هەژارییەوە تەنازول نەکات، ئەوە هەژارییەکی شەرافەتمەندانە (مُشَرِّف)یە، هەرچەندە لە ئیسلامدا هەژاریی مەدح کراو نیە، لە هیچ شوێنێکدا نیە لە قورئانێدا خوا مەدحی هەژاریی کردبێ، تەنیا لەیەك شوێندا خوا مەدحی هەژارانی کردوە، وەك لە ڕاستیی ژمارە حەوت (٧) دادێ.

٧)- خوا زۆر سیفەتی خراپی دەوڵەمەندانی خۆشگوزەران و زێدەڕۆیی کارو چرووك و ڕژدی لە قورئاندا، خستوونە ڕوو، بۆ وێنە:

١- ﴿ وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾ سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلۡخُرۡطُومِ ﴿١٦﴾ ﴾ القلم.

٢- ﴿ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣٤﴾ فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنۡ غِسۡلِينٖ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأۡكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ الحاقة.

٣- ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾ الماعون.

٤- ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّا ۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾﴾ الهمزة.

٨)- دەوڵەمەندانێ کە بۆ خوا صوڵحاون و، سەروەت و سامانەکەیان لە پێناوی خوادا بەکار دەهێنن، خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنان مەدحی کردوون، بۆ وێنە:

١/ ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾﴾ البقرة.

٢/ ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٦٥﴾﴾ البقرة.

٣/ ﴿إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَآءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾﴾ الإنسان.

٤/ ﴿وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ ﴿٢٧٢﴾﴾ البقرة.

٩)- بەزۆریی وا بووە ئەو حوکمڕانانەی کە خۆ سەپێن بوون، هەر ئەوانەش بوون کە خۆشگوزەران و زێدەڕۆییکارو خراپەکار بوون، لە زەوییدا، ئەوە زۆر ڕوونە، ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، ئنجا بەزۆرییش وایە: چینە سیاسییەکە، کە خۆبەزلزانانن، لەگەڵ چینە دەوڵەمەندەکەدا، کە خۆشگوزەران و زێدەڕۆییکەرانن، بەزۆریی یەکدەست بوون لەبەرامبەر پێغەمبەراندا سەلامی خوایان لێبێ، هەر بۆیەش من زۆر جار گوتوومەو دووبارەی دەکەمەوە: کە ئێمە وەك ئەهلی ئیسلام و ئیسلامیی دەبێ وریا بین و هەمیشە لەگەڵ خەڵکی چەوساوەو لێقەوماودا بین و، دژی ستەمکاران و قۆرخکارانی نازو نیعمەتەکان و، ئەو کەسانەبین کە سەروەت و سامانی وڵات بۆ خۆیان و خزم و حیزبیان قۆرخ دەکەن.

١٠)- خوای کاربەجێ هەرگیز مەدحی هەژاریی نەکردوە، تەنیا لەیەك کاتدا نەبێ، ئەویش کاتێك کە مسوڵمانان بەهۆی جەنگ و جیهادەوە، بەهۆی کۆچ کردنەوە لە پێناوی خواداو، بەهۆی کارو پڕۆژەی ئیسلامیی و، بەهۆی فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپەوە، تووشی هەژاریی دەبن، وەك دەفەرموێ:

﴿ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ﴿٢٧٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: با (ئەو هاوکارییە) بۆ هەژارانێك بێ کە لە پێناوی خوادا تەنگیان پێ هەڵچنراوە، ناتوانن بە زەویدا بێن و بچن، بابای نەناس بەهۆی نەفس بەرزییانەوە بە دەوڵەمەندیان تێدەگات، بەڵام تۆ بە نیشانەیان دەیانناسی، مکووڕانە داوای هاوکاریی لە خەڵك ناکەن.

لێرەدا خوا چەند سیفەتێکی جوانیان لێ هەڵدەدا، کە ئەوانە کەسانێکن خوا مەدحیان دەکات، لەبەر ئەوەی هەژارییەکەیان بەهۆی تەمبەڵیی و تەوەزەلییەوە نەبووە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە بووە کە لە پێناوی خوادا، فەقیر کەوتوون، لە

پێناوی دینی خوادا، نەیانپەڕژاوەتە سەر کارو کەسابەت و سەروەت و سامان کۆ کردنەوە، تەنیا لەو حاڵەدا هەژاریی ستایش کراوە، ئەگەرنا لە حاڵەتەکانی دیکەدا ستایشکراو نیەو هەژاریی وەك بەڵایەك دانراوە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کوفرو هەژاریی بەیەکەوە هێناون و، فەرموویەتی: {أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ} أخرجه ابن أبي شيبة برقم (٢٩١٨٤)، وأبو داود برقم (٥٠٩٠)، وأخرجه أيضا أحمد برقم (٢٠٤٤٦).

واتە: ئەی خوایە! پەنا دێنمە بەر تۆ لەبەر هەژاریی و کوفر.

چونکە زۆر جار بەهۆی هەژارییەوە، خەڵکی تووشی گوناح و تاوان و لادان دێن.

باسی
پێنجەم

## پێشکەوتن و دواکەوتن
## (التقــدُّم والتــأَخُّر)

ئایا تێڕوانینی ئیسلامیی بۆ پێشکەوتن و دوا کەوتن چۆنە؟ دەڵێین: لەبەر ئەوەی وەك پێشتر باسمان کرد: بووناسیی ئیسلامیی وا تەماشای ژیانی دنیا دەکات، کە جێگای تێدا تاقیکرانەوەیە، هەروەها وا لە ڕۆژی دوایی دەڕوانێ کە: شوێنی تێدا حەسانەوەیە، ئا ئەوە دەکرێتە پێوەر، کە هەر کەسێك بەرەو خوا بچێ و لەخوا نزیك بێ و، بۆ خوا صوڵحاو بێ، ئەوە ئینسانێکی پێشکەوتوویە، بەپێچەوانەوەش: ئەوەی کە خوا لێی تووڕە بێ، یان خوای لەخۆی ڕازی نەکردبێ، ئەگەر هەموو دنیای هەبێ، ئەگەر هەرچی بڕوانامەیە بەدەستی بێنێ، مادام نەیتوانیبێ خاوەنی خۆی لەخۆی ڕازی بکاو، ئەو حیکمەتەی کە خوا بۆی دروستکردووە، بیهێنێتە دی، کە بریتیە لە بەندایەتیی کردن بۆ خواو، مادام لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیا دەرنەچێ، ئەوە بە دواکەوتوو لەقەڵەم دەدرێ!

خوای تاك و پاك لە سیاقی چەند ئایەتێکدا باسی پێشکەوتن و دواکەوتن دەکات، دەفەرمویێ: ﴿ كَلَّا وَٱلْقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَآ أَسْفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ ﴾ المدثر.

واتە: نەخێر، سوێند بە مانگ و، سوێند بە شەوگار کە کۆتایی دێ و، سوێند بەبەرەبەیان کە دەپشکوێ، ئا ئەمە {واتە: ئەم سوورەتە، یاخود ئەم هەڕەشەیە کە دەکرێ، یاخود ئەوە کە نۆزدە فریشتەیەکە دۆزەخەوانی دۆزەخن و سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن} یەکێکە لە شتە هەرە گەورەکان، ترساندنە بۆ بەشەر، بۆ هەر کامێك لە ئێوە ئەگەر بیەوێ {بەهۆی خوا پەرستییەوە} پێش بکەوێ، یاخود دوا بکەوێ {بەهۆی ڕوو لە تاوان و خراپە کردنەوە}.

دوایی خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا أَصْحَابَ الْيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّاتٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ الْمُجْرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰ أَتَانَا الْيَقِينُ ﴿٤٧﴾﴾ المدثر.

واتە: هەر کەس بارمتەی کردەوەیەتی (لە دۆزەخ دا)، جگە لە هاوەڵانی ڕاستە (کە بەدەستی ڕاست لیستی کردەوەکانیان وەرگرتۆتەوە) لەنێو باغاندان، لە تاوانباران دەپرسن: چ شتێك ئێوەی خستە نێو کڵپەی دۆزەخەوە؟ گوتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین و، خواردنمان بە نەداران نەدەداو، ڕۆژی سزاو پاداشتمان بە درۆ دادەناو، لەگەڵ تێڕژاوانی قسەی خراپ هەر تێدەڕژاین، تاکو مردنمان گەیشتە سەر.

یەکێ بۆی هەیە بڵێ: باشە ئەوە پێشکەوتن و دوا کەوتنی مەعنەویی، ئەدی لە ڕووی ماددییەوە؟ دەڵێین: لە ڕووی ماددییەوە، ئیسلام نەك هەر دژی پێشکەوتنی مادديی نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە: مسوڵمانان هان دەدا بۆ پێشکەوتنی مادديی، بۆ دەوڵەمەند بوون، بۆ خاوەن ئیمکانیەت بوون، بۆ دەست ڕۆیشتوو بوون، بەبەڵگەی ئەوە کە خوا سبحانە و تعالی ستایشی سولەیمان و داوود سەلامی خوایان لێ بێ، دەکات، کە هەردووکیان دوو پێغەمبەری پادشا بوون، دەفەرموێ:

١- ﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ عِلْمًا ۖ وَقَالَا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾﴾ النمل: ١٥

٢- ﴿ وَوَهَبْنَا لِدَاوُدَ سُلَيْمَانَ نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ (٣٠) ﴾ ص.

واتە: سولەیمانمان بە داوود بەخشی، باشترین بەندە بوو، زۆر گەڕاوە بوو (بۆ لای خوا).

سولەیمان کێ بوو؟ پێغەمبەرێك و پادشایەك بووە، سەنتەری دەسەڵاتی شاری قودس بووە، (با)ی بۆ دەستەمۆ بووە، (جند)ی بۆ دەستەمۆ بووە، هەروەها (باڵندە)و، لەگەڵ زیندەوەراندا قسەی کردوە، بەکورتیی: دەستەڵاتێکی بووە، کەس نەیبووە، وەك خۆشی پاڕاوەتەوەو فەرموویەتی:

﴿ وَهَبْ لِي مُلْكًا لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ (٣٥) ﴾ ص.

واتە: خوایە! موڵك و دەسەڵاتێکم بدەیە لەدوای من کەس نەیبێ، بێگومان هەرتۆی بەخشەر.

خواش دوعاکەی گیرا کردوە، چونکە موڵك و دەسەڵاتەکەی هەموو بەکار هێناوە بۆ ڕەزامەندیی خوا، بۆ بانگەوازو هیدایەت دانی خەڵك.

بەڵێ خوا مەدحی داوودو سولەیمان دەکات، هەروەها مەدحی (ذو القرنین) دەکات، کە هەندێ دەڵێن: ئەو ناوەی بۆیە لێنراوە، چونکە ئەوپەڕو ئەوپەڕی دنیای گرتوون، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا (٨٤) ﴾ الکهف.

واتە: ئێمە لە زەویدا دەستڕۆیشتوومان کردو، بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك هۆکارمان بۆ ڕەخساندبوو.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێ فەتحی مەککە دەکات، خوای بەخشەر دەفەرموێ:

﴿ إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ (١) وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا (٢) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا (٣) ﴾ النصر.

واتە: هەر کات یارمەتی خوا هات و کردنەوە (ی دەروازەکانی شاری مەککە) ئەنجام درا. خەڵکیشت دی کۆمەڵ کۆمەڵ هاتنە نێو ئایینی خواوە. لەو کاتەدا بە ستایش کردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرەو داوای لێوردنی لێ بکە، بە دڵنیایی ئەو زۆر تۆبە وەرگرە.

یانی: ئەی موحەممەد! لەو مەقامەدا سوپاس و ستایشی خوا بکە، کە ئەو نیعمەتەی بەتۆدا کە دەسەڵاتت هەبێ! کەواتە: دەستەڵات هەبوون لەئیسلامدا زەم کراو نیە، بەڵام بەمەرجێك بۆ ڕازیی کردنی خوای پەروەردگار بێ.

هەروەها سەروەت و سامان هەبوون، زەمکراو (مذموم) نیە، بەڵام بەمەرجێك لە ڕەزامەندیی خوادا بەکار بهێنرێ.

ئێمە سێ ئەرکی گەورەی مسوڵمانەتییمان هەن، بە دەوڵەمەندان نەبێ جێبەجێ نابن:

١)- زەکات، لە دەوڵەمەندان دەکەوێ.

٢)- حەج، ئەوەی توانای ماددیی نەبێ، ناتوانێ سەفەری حەج بکات.

٣)- جەنگ و جیهاد، ئەویش بە توانای ماددیی دەکرێ.

کەواتە: لە ڕووی ماددییشەوە، پێشکەوتنی مسوڵمانان ستایشکراوەو، دوا کەوتنیان زەمکراوە، ئایا پێتان وایە ئێستا خوا لە مسوڵمانان ڕازییە، کە لە دەرزییەك بگرە تاکو گەورەترین شت، پێویستییان بە ئەهلی کوفرە؟ بێگومان بارودۆخی مسوڵمانان لە ئێستادا لە تەرازووی ئیسلامدا، زۆر شتێکی نەویستراوو بوغزێنراوە، ئەبو حامیدی غەززالیی دەوری نۆسەد (٩٠٠) ساڵ لەمەو پێش دەڵێ: ئەگەر مسوڵمانان بۆ هەر شتێك موحتاجی غەیری خۆیان بن، گوناهبارن، لەبەر ئەوەی فەرزێکی کیفایەیان چواندوە، چونکە دەبێ هەموو شتێکی خۆیان بۆخۆیان دابین بکەن و، بۆ هیچ شتێ پێویستییان بە غەیری خۆیان نەبێ[1].

---

(١) بڕوانە: (إحياء علوم الدين)، ج١ ص ٣٤، ط٣/٢٠١٠م، دار صادر - بيروت، كتاب العلم، الباب الثاني.




---

في العلم المحمود والمذموم وأقسامهما وأحكامهما..

ئەمەش دەقی قسەکانی (الغزالي)یە لەو بارەوە:

(أما فرض الكفاية فهو علم لا يستغنى عنه في قوام أمور الدنيا، كالطب إذ هو ضروري في حاجة بقاء الأبدان، وكالحساب، فإنه ضروري في المعاملات وقسمة الوصايا والمواريث وغيرهما، وهذه هي العلوم التي لو خلا البلد عمن يقوم بها حَرِجَ أهل البلد، وإذا قام بها واحد كفى وسقط الفرض عن الآخرين، فلا يتعجب من قولنا إن الطب والحساب من فروض الكفايات، فإن أصول الصناعات أيضاً من فروض الكفايات، كالفلاحة والحياكة والسياسة بل الحجامة والخياطة).

# باسی شەشەم

## لەنێوان سەرپێبوون (إنتماء) بۆ گەل و، دۆستایەتیی کردنی ئۆممەتدا

زۆر کەس ئەم دووانە: سەرپێبوون بۆ گەل (الإنتماء للشعب) و، دۆستایەتییکردنی ئۆممەت (الولاء للأمة)، پێکەوە تێکەڵ دەکات، یان پێی وایە تێك دەگیرێن! بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، کە ئەو دووانە کە تێکەڵ و ئاوێتەبن و کە لەیەك جیا نەکرێنەوەو، نە پێکەوەش دژو ناکۆکن، تاکو تێك بگیرێن! با بزانین چۆن؟!

لە حەوت بڕگەدا ئەوە ڕوون دەکەینەوە:

### یەکەم:

ئینسان بەبێ ئەوەی ئیرادەو ئیختیاری خۆی بێ، ئینتیمای هەیە بۆ گەل و نەتەوەکەی: کورد بۆ کوردو، عەرەب بۆ عەرەب و، تورك بۆ تورك و، ...هتد، ئەوە بەدەست خۆمان نیەو خوا ئێمەی وا دروستکردوە، کەواتە: ئەوە نەشوێنی مەدحەو نە شوێنی زەممە، کە تۆ کوردی و ئەو عەرەبەو فڵان تورکە، چونکە

ویستی ئێمەی تێدا نەبووە، وەك خوای کاربەجێ و دادگەر فەرموویەتی:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك وەدیهێناوە، پاشان گێڕاومانن بە چەندان گەل و هۆز، تاکو یێك ئاشنابن (پێکەوە هاوکارو تەبابن) و بێگومان بە ڕێزترینتان لەلای خوا پارێزکارترینتانە، بە دڵنیایی خوا زانای شارەزایە.

دووەم:

بەڵام دۆستایەتییمان لەگەڵ ئۆممەتدا، ئاشکرایە هەڵبژاردنی خۆمانی تێدایە، بۆیە ئینسان لەسەری مەدح دەکرێ و، لەسەر نەبوونەکەشی زەم دەکرێ، خوا سبحانە و تعالى لە قورئاندا کە باسی پێغەمبەرانمان بۆ دەکات، بانگی گەلی خۆیانیان کردوەو مولاتەفەی قەومی خۆیانیان کردوە، هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، فەرموویانە: ئەی گەلەکەم! ئەی گەلەکەم!، بۆ نموونە سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

١- ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾ ﴾ الأعراف.

٢- ﴿ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾ الأعراف.

٣- ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَـٰلِحًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴿٧٣﴾ ﴾ الأعراف.

٤- ﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۗ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ﴿٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

کەواتە: ئەگەر ئێمەش گەل و کۆمەڵگای خۆمان خۆش بوێ و، گرنگیی پێ بدەین و، خەمی لێ بخۆین و، پەرۆشمان بێ و، بەتەنگیەوە بین، هەروەك پێغەمبەرانمان کردوە، سەلامی خوایان لێبێ.

ئنجا ئەو ئوممەتەی کە دۆستایەتیی عەقیدەییمان بۆی هەیە، بەتەئکید ئینسانی ئیماندار دەبێ ئوممەتی خۆی، ئوممەتی ئیسلام، ئوممەتی ئیمان، خۆشەویستیی و دڵسۆزیی و پەرۆشیی هەموو، بۆ ئەو بێ.

## سێیەم:

میللەتەکەی خۆشت مادام بەشێك بێ لە ئوممەت، ئەوە هەم ئینتیمات بۆی هەیە، وەك ئینتیمای نەتەوەیی، هەم وەلائیشت بۆی هەیە، وەك بەشێك لە ئوممەت، کەواتە: ئەو دووانە تێك ناگیرێن، خوای دادگەر بە پێغەمبەری خاتەمی فەرمووە:

١- ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ الشعراء.

٢- ﴿ وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ الزخرف.

## چوارەم:

بەڵام لە حاڵێکدا کە ئەو گەلە، ئەو خەڵکە، دوور لە خوا بێت و پشت لە ئیسلام بێ، لەو حاڵەتەدا، بەتەئکید مەگەر تەماعی چاککردن و ئیصلاح و گۆڕانکارییمان تێیاندا هەبێ، ئەگەرنا ئیماندار ناتوانێ لەگەڵ کەسێکدا، هەرچەندە خزم و نزیکی بێ، دۆستایەتیی و نزیکیی بێ، مادام ئەو بەینی لەگەڵ خوادا نەبێ، خوای پەروەرگار زۆر بە ڕوونیی لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾﴾ المجادلة.

واتە: کەسانێکت چنگ ناکەوێ کەسانێك کە ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێ، دۆستایەتییان هەبێ لەگەڵ کەسانێکدا کە دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن، هەرچەندە ئەو کەسانە باییان بن، کوڕیان بن، برایان بن، خزم و عەشیرەتیان بن، ئا ئەوانە خوا ئیمانی لە دڵدا نووسیون و، بە ڕووحێك لەلایەن خۆیەوە بەهێزی کردوون و، دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، هەتا هەتایە تێیاندا دەمێننەوە، خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازیین، ئەوانە کۆمەڵی خوان، ئاگاداربن! بە دڵنیایی هەر کۆمەڵی خوا سەرفرازن.

## پێنجەم:

کۆمەڵگایەك خەڵکێك، ئومێدی ئەوەت پێیان هەبێ بە قسەت بکەن و کاریگەریی چاکت لەسەریان هەبێ، ئەوە دیارە دروستە لەگەڵیان بی، وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێ: {الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ الَّذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ} أخرجه وأحمد برقم (٥٠٢٢)، والترمذي برقم (٢٥٠٧)، وابن ماجه برقم (٤٠٣٢)، قال الألباني: صحيح، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

واتە: ئەو ئیماندارەی لەگەڵ خەڵك (خەڵك بەگشتی مسوڵمان و نا مسوڵمان) تێکەڵ دەبێ و، ئارام دەگرێ لەسەر ئازاریان، پاداشتی مەزنترە لەو کەسەی لەگەڵ خەڵکی تێکەڵ نابێ و، لەسەر ئازاریان ئارام ناگرێ.

شەشەم:

هەموو گەل و نەتەوەکان لەو ڕووەوە کە گەل و نەتەوەن، یەکسان و وەك یەکن و هیچ کامیان لە خودی خۆیدا لەوانی دیکە باشتر نیەو، هەر خۆ پێ چاکتر بوونێك لە ڕووی نەتەوەییەوە، دەمارگیریی (تَعَصُّب)ەو لە تەرازووی شەریعەتدا ڕەتکراوەیە.

چونکە خوای دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ ﴿١٣﴾﴾ الحجرات.

کەواتە: هەموو گەل و نەتەوەکان بە ویستی خوا پەیدا بوون و هیچ کامیان پلەو ئیمتیازیان بەسەر ئەوانی دیکەدا نیە.

ئنجا فەرمایشتی خوا: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ﴿١٣﴾﴾ الحجرات، بەتەواویی ڕێی لە هەر جۆرە خۆهەڵکێشانێکی دەمارگیرانە گرتوە.

پێغەمبەری پێشەواشمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {ليس مِنّا من دعا إلى عصبية، وليس مِنّا مَنْ قاتل على عصبية، وليس مِنّا من مات على عصبية} أخرجه أبو داود برقم (٥١٢١)، وضعفه الألباني.

واتە: هەرکەس بانگەشەی دەمارگیریی بکات لە ئێمە نیەو، هەرکەس دەمارگیرانە بجەنگێ لە ئێمە نیەو، هەر کەش دەمارگیرانە بمرێ لە ئێمە نیە.

هەڵبەتە دەمارگیریش ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر ستەم هاوکاریی خەڵکەکەی خۆی بکات، ئەگەرنا خۆشویستن و مشوور لێخواردنی بۆیان دەمارگیریی نیە، وەك لەم دەقەی سوننەتەوە دیارە:

{أَمِنَ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُحِبَّ الرَّجُلُ قَوْمَهُ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ مِنْ الْعَصَبِيَّةِ أَنْ يُعِينَ الرَّجُلُ قَوْمَهُ عَلَى الظُّلْمِ} أخرجه أحمد في المسند برقم: (١٧٥٠٧).

کەواتە: گەل و نەتەوەکان مافی یەکسانیان هەیە لە ڕووی خاوەنی ئیرادەو ئیدارەی خۆبوون و مافی چارەنووسی خۆ بەدەستبوونەوە.

حەوتەم:

پێویستە مسوڵمانان هاوسەنگیی (إتِّزان) بپارێزن لە بواری خەمخۆریی و دڵسۆزیی نواندنی دا بەرانبەر بەگەل و نەتەوەکەیان، بەرانبەر بە ئۆممەتە ئیسلامییەکەیشیانداو، پێویستە هەرکەسە هەق و مافی خۆی پێبدەن و، خۆیان و لە تێپەڕاندن و بەزایەدان (إفراط وتفريط) بپارێزن و بەپێی فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕەفتار بکەن: {إِنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ} أخرجه البخاري برقم: (١٨٦٧).

باسی
حەوتەم

## بەختەوەریی و ژین تاڵیی

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ئاوا تەماشای بەختەوەریی دەکرێ:

بەختەوەر کەسێکە توانیبێتی خوا لەخۆی ڕازی بکات و، بەدبەخت کەسێکە کارێکی کردبێ خوا لەخۆی تووڕە بکات، ڕەنگە یەکێك بڵێ: ئایا ئینسان ئەگەر ماڵ و حاڵێکی باشی هەبێ و کوڕو کچی هەبن و، جێگاو ڕێگای باشی هەبێ، بەختەوەر نیە؟ دەڵێین: نەخێر، چونکە دەگونجێ کەسێك ئەوانەی هیچیان نەبێ، بەڵام خوا لێی ڕازی بێ، مانای وایە هەر بەختەوەرە، هەروەها دەگونجێ ئەوانەی هەموویان هەبێ، بەڵام ئەگەر خوا لێی تووڕە بێ، هەر بەدبەختە، چونکە ئیعتیبار بەوە دەکرێ: ئەم ژیانی دنیایە چۆن بەجێ دەهێڵێ؟ کاتێك کە دنیا بەجێ دەهێڵێ، چی پێیە؟ ئەگەر ڕەزامەندیی خوای پێ بێ، ئەوە گەورەترین ئامانج و ئەنجامی بەدەست هێناوە، بەڵام ئەگەر نەیتوانیبێ، خوا لەخۆی ڕازی بکات، هەرچەندە سەروەت و سامانی هەبێ، خزم و دەسەڵاتی هەبێ، هەمووی لەو ژیانە کەم و کورتەدا بەجێ دەهێڵێ و، دوایی لێپرسینەوەو سزایەکەی بۆ دەمێنێتەوە!

بەڵێ لە ئیسلامدا: مرۆڤی بەختەوەرو دواڕۆژ ڕوون، کەسێکە بەهۆی بەندایەتیی کردنی بۆ خواو نیزیکیی لە خواوە، خوا لێی ڕازی بێ و، بابای بێ

مرادو ژین تاڵ و بەدبەختیش، كەسێكە بەهۆی كوفرو خراپەو ستەم و لادانەوە، لە خوا دوور بێ و خوا لێی نارازی بێ، وەك خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه.

واتە: هەردووك لاتان وێكڕا لێی دابەزن {لە ئاسمان یان بەهەشت} هەندێكتان دوژمنی هەندێكتانن، ئنجا هەر كات لەمنەوە ڕێنماییتان بۆ هات، هەر كەسێ شوێن ڕێنمایی من بكەوێ، نە گومڕا دەبێ نە بەدبەخت دەبێ، بەڵام هەركەسێ پشت لە بەرنامەی من بكات، ئەوە ژیانێكی تەنگ و تاڵی دەبێ و لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە كوێریی حەشری دەكەین.

بەڵێ بەڕێزان! ئینسانی بێ بڕوا، ئینسانی دوور لەخوا، هەمیشە ژیانی تەنگ و تاڵە، من ئاگادارم، ئەو چینە سیاسییەی دوور لە خوان، هەرچەندە سەروەت و سامانیان هەیەو هەموو شتێكیان هەیە، بەڵام هەست بەو بەختەوەریی و ئارامییە ناكەن، كە مسوڵمانێكی زۆر سادە هەستی پێ دەكات، بۆیە ئەهلی تەزكیەو تەصەووف، ئەوانەی بە چاكیی ڕێی شەریعەتیان گرتوە، هەندێكیان گوتوویانە: {لو علم الملوك ما نحن فيه، لجالدونا عليه بالسيوف} واتە: ئەگەر پادشایەكان بیانزانیبایە ئێمە لە چ وەزعێكی خۆشداین، بە شمشێران شەڕیان لەگەڵدا دەكردین، بۆ ئەوەی ئەو خۆشییەمان لێ بستێنن!

بەڵێ بەختەوەریی تەنیا پەیوەندیی بە دڵ و دەروونی ئینسانەوە هەیەو، دڵ و دەروونێكیش كە ئیمانی تێدایە، پڕە لە هێمنیی و ئۆخژن و بەختەوەریی، لەقەدەر ئیمانەكەی.

بەڵام بابای بێ بڕواو دوور لە خوا هەرچەندە دەستەڵات و سامانی دنیای هەبێ، هەمیشە دڵ زبڵدانی تێدا تروكانی گەراو میكرۆبی: دڵە ڕاوكەو ترس و خەم و خەفەت و پەژارەو بێ ئۆقرەیی و ....هتدە.

ئێستاش با ئەوەی گوتمان لە پێنج بڕگاندا بە پشت بەستن بەچەند ئایەتێکی قورئانی بەپێز زیاتر ڕوون بکەینەوە:

**یەکەم:** بەختەوەریی ڕاستەقینە لەم ژیانە دنیاییەدا، تەنیا بە شوێنکەوتنی ڕێنمایی خوای میهرەبان دەستەبەر دەبێ:

وەك فەرمایشتی خوا ﴿ فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَایَ فَلَا یَضِلُّ وَلَا یَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾ طه، زۆر بەڕوونیی لەو بارەوە نوختەی خستۆتە سەر پیت و، بەرجەستە بوون (مصداق)ی ئەو ڕاستییەش لە ژیانی بەشەردا وەك ڕۆژی ڕوون دیارە.

**دووەم:** ڕێنمایی تەنیا لەلایەن خوای تاك و پاكەوەیەو هیچ كەس و لایەنێكی دیكە توانای هیدایەتدان و، بە ئامانج گەیاندنی مرۆڤانی نیە.

وەك خوای پەنهانزان فەرموویەتی:

١- ﴿ قُلۡ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلۡهُدَىٰۗ ﴿١٢٠﴾ ﴾ البقرة.

واتە: بڵێ: بە دڵنیایی تەنیا ڕێنمایی خوا ڕێنمایی (ڕاستەقینە)یە.

٢- ﴿ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ ﴿٧٣﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بڵێ: بێگومان ڕێنمایی تەنیا ڕێنمایی خوایە.

٣- ﴿ قُلۡ هَلۡ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن یَهۡدِیٓ إِلَى ٱلۡحَقِّۚ قُلِ ٱللَّهُ یَهۡدِی لِلۡحَقِّ ﴿٣٥﴾ ﴾ یونس.

واتە: بڵێ: ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتان ڕێنمایی بەرەو هەق دەکات؟ بڵێ: تەنیا خوا ڕێنمایی بەرەو لای هەق دەکات.

**سێیەم:** هەرکەس پشت بکاتە ئایین و هیدایەتی خوا: بێ مرادو ژینتاڵە:

وەك خوا عز وجل فەرموویەتی: ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِی فَإِنَّ لَهُۥ مَعِیشَةً ضَنكًا وَنَحۡشُرُهُۥ یَوۡمَ ٱلۡقِیَـٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالْقَطِيفَةِ وَالْخَمِيصَةِ} أخرجه البخاري برقم (٢٧٣٠)، وابن ماجه برقم (٤١٣٥).

واتە: کۆیلەی زێڕو زیوو پۆشاکی نایاب، بەدبەخت و بێمرادە.

**چوارەم:** بڕواداری کردار باش - نێر بێ یان مێ- هەم ژیانی دنیای پاك و چاك و شادمانانە دەبێ و، هەم لە دوارِۆژیشدا باشترین پاداشتی دەبێ:

وەك خوای بەخشەر فەرموویەتی: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل.

**پێنجەم:** ژیانی بەدبەختانەی بێ بڕوایان لە دنیادا، بەدبەختیی هەتا هەتاییان بۆ بەرهەم دێنێ، کە هەرماو (خالد) بوونیانەلە دۆزەخداو، ژیانی دنیای بەختەوەرانەی بڕوادارانیش، بەختەوەریی هەمیشەییان بۆ بەرهەم دێنێ، کە بەردەوام مانەوەیانە لە بەهەشتدا:

وەك خوای زاڵی میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ يَوْمَ يَأْتِ لَا تَكَلَّمُ نَفْسٌ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ فَمِنْهُمْ شَقِىٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُوا۟ فَفِى ٱلنَّارِ لَهُمْ فِيهَا زَفِيرٌ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُوا۟ فَفِى ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَ ۖ عَطَآءً غَيْرَ مَجْذُوذٍ ﴿١٠٨﴾ ﴾ هود.

## بـــەرایی

خوێنەری بەڕێز!

لەم بەشی چوارەمەدا، چوارەمین پایەی بیرکردنەوەی ئیسلامیی دەتوێژینەوە، کە بریتیە لە (بەهایەکان) واتە: بەها بەرزە ئیسلامییەکان {القِيَم الإسلامية العُلْيا}.

وشەی (بەها)ش تەرجەمەی وشەی (قِيمَة)یە، کە بە (قِيَم) کۆ دەکرێتەوە، ئنجا هەرچەندە لە زمانی کوردییدا، لەبەرانبەر (قيمة)دا هەر کام لە وشەی (بەها) و (نرخ) بەکاردێن، بەلام بەپێی باو (عُرف)، وشەی نرخ زیاتر بۆ کەل و پەل و شمەکی ماددیی بەکاردێ و، وشەی (بەها)ش بۆ شتی مەعنەویی و نابەرهەست.

هەڵبەتە لە هەموو زمانەکانیشدا هەروایە، ئەو وشانە لە ئەسڵدا بۆ شتی ماددیی و بەرهەست بەکار هاتوون، دوایی دەخوازرێنەوە بۆ تەعبیر کردن لە حاڵەتە نابەرهەست و شتە مەعنەوییەکان، بۆ نموونە دەگوترێ:

فلانکەسی سەنگین، یان گرانقەدر، یان شیرین...

ئاشکراشە کە بەها بەرزەکان (القيم العليا) لە ئیسلامدا زۆر زۆرن، بەڵام ئێمە لەم بەشەدا حەڤدە (١٧) دانەیان لێ دەخەینە ڕوو، ئەویش لە حەوت (٧) بواردا، هەر کامیان لە باسێکدا بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

١- بواری ئیمان.

٢- بواری خوا پەرستیی.

٣- بواری زانیاریی و زانست.

٤- بواری حوکم و سیاسەت.

٥- بواری حوکم و دادوەریی (قضاء).

٦- بواری کۆمەڵایەتیی.

٧- بواری جیهادو جەنگ لە پێناوی خوادا.

باسی
یەکەم

## بـــواری ئیمـــان

وەك پێشتر باسمان کرد: ئیمان بناغەی دینداریی و مسوڵمانەتییە، بەڵام دیارە ئیمانیش بناغەکەی بریتیە لە {بوونناسیی} واتە: چۆن تەماشای بوون دەکەین؟ ئنجا ئیمان بریتیە لە هەڵوێست وەرگرتن لە بەرامبەر بووندا، کە بەدیهێنەری بوون، خوایە سبحانه و تعالی، جا ئیمان ئەوەیە ئەو خوایە وەك لە زاتی خۆیدا بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگارە، تۆش بە تاکە پەرستراو (معبود) و دادوەر (حَکَم)ی خۆتت قبووڵ بێ، هەڵبەتە ئێمە خوای پەرەوەردگارمان بە: بەدیهێنەرو خاوەن و مشورخۆرو دادوەرو پەرستراو قبووڵ بێ، یان نا، خوا هەر خوایە سبحانه و تعالی، بەڵام ئەوە خۆمانین دەبێ ئەو هەڵوێستە لە خۆماندا بهێنینە دی، ئەوە بە نسبەت خوای تاك و پاکەوە عز وجل.

بە نسبەت فریشتەکانی خواشەوە: وەك خوا وەسفی کردوون، ئاوا پەسەندی بکەین و بڕوامان پێیان بێ.

هەروەها کتێبەکانی خواو، پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ و، ڕۆژی دوایی و، قەدەریش بەهەمان شێوە.

بەرزترین بەهاش لەبواری ئیماندا، بریتیە لە خوا بەیەکگرتن (توحید) تەنیا خوا پەرستن، ئنجا ئایا (توحید الله) چییەو چۆنە؟! بەعەرەبیی دەتوانین ئاوا تەعبیری لێ بکەین:

{التوحید: إفراد الله تعالی فکراً وعملاً، والتعامل معه علی أساس کونه واحداً أحداً فرداً صمداً، کما هو في الواقع، من حیث ذاته وأسماؤه الحسنی، وصفاته العُلی، وخالقیَّتُهُ، وربوبیَّتُهُ، ومالکیَّتُه، وألوهیَّتُهُ، وَوِلایَتُهُ، وحاکمِیَّتُهُ}.

واتە: خوا بەیەکگرتن (توحید): ئەوەیە ئێمە خوای بەرزو مەزن تاك بکەینەوەو هیچ هاوبەشی بۆ دانەنێین، چ لە ڕووی تیۆریی و فیکرییەوە، چ لە ڕووی کردەییەوە {لەڕووی تیۆریی و فیکرییەوە واتە: ئیمان، لەڕووی کردەییەوەش واتە: عیبادەت، پەرستن} مامەڵە لەگەڵ کردنیشی لەسەر ئەو بناغەیە کە: یەکەو تاکیشە، جێی نیازەو بێ نیازە، -وەك لە واقیعدا وایە- لەڕووی زاتیەوەو، لە ڕووی ناوە هەرەچاکەکانی و سیفەتە هەرە پەسندەکانییەوەو، لەڕووی بەدیهێنەرایەتییەوەو، لەڕووی پەروەردگارێتییەوەو، لەڕووی خاوەندارێتییەوەو، لەڕووی پەرستراوێتییەوەو، لەڕووی سەرپەرشتییکردنیەوەو، لەڕووی بەرنامەڕێژییەوە، بۆمان.

یانی: کۆمەڵگایەك، ئەگەر خوا بەیەککگر (مُوَحِّد) بێ، بەمجۆرە دەبێ[1]:

**یەکەم:** تێڕوانینەکانی و، بەهایەکانی و، پێوەرو تەرازووەکانی، تەنیا لەخواو لە شەریعەتی خوا وەردەگرێ.

**دووەم:** دروشمەکانی خوا پەرستیی، تەنیا پێشکەش بەخوا دەکات {واتە: هەموو ئەو شتانەی کە ئەگەر ئینسان ئەنجامیان بدات، بۆی دەبن بە نیشانە کە خواپەرستە: پاڕانەوە، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، نەزر، قوربانیی، سوێند پێ

---

(١) بۆیە باسی بوونناسیی (معرفة الوجود) و، بنەڕەتەکانی ئیمان (أصول الإیمان)مان نەکردوە، چونکە: مرۆڤی خوا بەیەکگرو تەنیا خوا پەرست، پێشتر بوونناسیی ئیسلامیی و بنەڕەتەکانی ئیمانی لە خۆیدا هێناونە دی و، خوا بەیەکگرتن (توحید)ەکەی بەرهەمی وانە.

خواردن، پشت پێ بەستن، ئەو پەڕی بە گەورەگرتن و، خۆشویستن و، سام و هەیبەت بەرامبەر هەبوون و ...هتد}.

**سێیەم:** یاسایەکانیش کە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی خۆییان پێ ڕێك دەخات، تەنیا لە خوا وەردەگرێ.

ئەوجار مانای وایە ئەو خەڵکە خوایان بەیەکگرتوە، کاتێك: هەرچی تێڕوانینیان هەیە دەربارەی شتەکان، هەروەها بەهایەکان و پێوەرەکانیان، تەنیا لە خواو لە دینی خوا وەربگرن، هەروەها دروشمەکانی خوا پەرستیی، تەنیا بۆ خوا پێشکەش بکەن و، غەیری خوایان تێدا بەشدار نەکەن، دیسان یاساکانی ژیانیش (شرائع الحیاة)یش تەنیا لەخوا وەربگرن، واتە: دیارییکردنی حەڵاڵ و حەڕام و، چاکەو خراپەو، ئەمرو نەهی و، ڕاست و چەوت، ئەو کاتە بەخوا پەرست و خوا بەیەککگر (مُوَحِّد) دادەنرێن.

لەو بارەشەوە ئایەت لە قورئاندا زۆر زۆرن، بەڵکو ئا ئەوە ئەو سوڕگەیەیە کە هەموو قورئانی لەدەور دەسووڕێ، سوڕگەی خوا بەیەکگرتن، هەموو قورئان باسی ئەوەیە، بەسەرهاتی پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێ، جەوهەرو کاکڵەکەی هەر بریتیە لەوەی کە پێغەمبەران هەموویان بۆ ئەوە هاتوون: تەنیا خوا بپەرسترێ.

ئا ئەوەش زۆر گرنگە ئێمە بیزانین: کە جیاوازیی و جیاکەرەوەی مسوڵمان و نامسوڵمان، جیاوازییە جەوهەرییەکە لێرەدایە: مسوڵمان خوا پەرستە، بەڵام غەیری مسوڵمان، ڕەنگە خوا بپەرستێ، بەڵام شتی دیکەشی لەگەڵ دەپەرستێ، یاخود خوا هەر ناپەرستێ، بەڵام پەرستن بەو چەمکە کە باسمان کرد، بەهەرسێ ڕەهەندەکەیەوەو لەهەرسێ بوارەکەیدا، نەك پەرستن بەو چەمکە تەسکەی کە ئێستا زۆربەی مسوڵمانان وا حاڵین، کە بریتیە لەوەی ڕکووع و سەجدەیان تەنیا بۆ خوایە! بەڵکو دەبێ وێڕای ئەوەو بگرە لەپێش ئەوەشدا: ئینسان تەنیا خوای پاك و تاك بەبەدیهێنەری خۆی و، بەپەروەردگاری خۆی و، بە خاوەنی خۆی و، بە پەرستراوی خۆی بزانێ و، ئەو ناوو سیفەتانەی کە بۆخوا بەکاریان دەهێنێ،

بۆ غەیری خوا بەكاریان نەهێنێ، ئنجا لەدوای ئەوە نۆرەی شتەكانی دیكە دێ و، ئەوانی دیكە، هەموویان لق و پۆپی ئەوەن.

با تەماشای هەندێك لە ئایەتەكانی قورئان بكەین، لەو بارەوە:

١- خوا لەبارەی تەنیا بەدیهێنەر (خالق) بوونی خۆیەوە، دەفەرموێ:

﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ ﴾ الزمر.

واتە: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكەو، بەسەر هەموو شتێكەوە چاودێرو سەرپەرشتیارە.

٢- لەبارەی تەنیا پەروەردگار بوونی خۆیەوە، فەرموویەتی:

﴿ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ قُلِ ٱللَّهُۚ ﴾ الرعد: ١٦.

واتە: بڵێ: كێ پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوییە؟ بڵێ: خوا.

٣- لەبارەی تەنیا خاوەنبوونی خۆیەوە بۆ هەموو شتێك، فەرموویەتی:

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلۡمُلۡكِ تُؤۡتِي ٱلۡمُلۡكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلۡمُلۡكَ مِمَّن تَشَآءُ ﴿٣٦﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بڵێ: ئەی خوایە! خاوەنی موڵك، موڵك و دەستەڵات بەهەركەس دەدەی كە بتەوێ و، موڵك و حوكمڕانیی لە هەركەس وەردەگریەوە، كە بتەوێ..

٤- لەبارەی تەنیا پەرستراوێتیی خۆیەوە، فەرموویەتی:

﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة.

واتە: خوا، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتیارە.

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾ الأنبياء.

واتە: لەپێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە جگە لەمن هیچ پەرستراوێك نیە، تەنیا من بپەرستن.

وەك گوتمان: ئایەت لەو بارەوە زۆر زۆرن، گرنگ ئەوەیە ئێمە بزانین: بناغەی ئیمان و مسوڵمانەتیی، ئەو بەها بەرزەیە کە پێی دەگوترێ: خوا بەیەکگرتن (التوحید)، کە کاکڵ و جەوهەری ئیمان پێك دەهێنێ، چونکە تەماشا بکەن! هەموو پایەکانی ئیمان لەدەوری خوا بەیەکگرتن دەچەرخێن:

١- خوای کاربەجێ فریشتەکانی ناردوون.

٢- بەرنامەو کتێبەکانی پێدا ناردوون.

٣- بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ.

٤- کە مرۆڤ و جن تەنیا ئەو بپەرستن.

٥- ڕۆژێکیشی داناوە کە ڕۆژی دواییە، ڕۆژی دیدارو گەیشتنەوەیە بە خوا، تاکو لە بەندەکانی بپێچێتەوە، کە ئایا هەڵوێستیان لەبەرامبەر خوا: تاکە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی خۆیاندا، چۆن بووە؟ ئایا هەر ئەویان پەرستوە، یاخود وێڕای ئەو شتی دیکەشیان پەرستوە؟!

ئنجا بۆ زانیارییتان! گرفتی بەشەر بەدرێژایی مێژوو، ئەوە نەبووە کە خەڵك دان بە بوونی خوادا نەهێنن، ئەوە نەبووە کە خوا وەك بەدیهێنەرو پەروەردگار نەناسن! گرفت و کێشەی بەشەر هەمیشە ئەوەبووە کە لەمامەڵە لەگەڵ خوادا بەهەڵە داچووەو، وێڕای خوا شتی دیکەشی پەرستوە، یانی: گرفتی بەشەر، بریتی بووە لە شیرك، نەك ئیلحاد، بۆیە زۆرترین پانتایی لە قورئاندا باسی چەسپاندنی تەوحیدو هەڵوەشاندنەوەی شیرك دەکات و، دەکات، کەمێك لە ئایەتەکان باسی ئیلحاد دەکەن و[1]، بەرپەرچی ئیلحاد دەدەنەوە، چونکە ئیلحاد واتە: دان نەهێنان

---

(١) نەك وەك کاك ناصری سوبحانیی - ڕەحمەتی خوای لێبێ- گوتوویەتی: کە گوایە: تاکە ئایەتێك لە قورئاندا باسی ئیلحادی نەکردوە! {بڕوانە: لادانەکانی بەشەرییەت و، ژیانی موئمینانە، لا:٤٠، چاپی یەکەم/٢٠١١} لە مەوسووعەی: ((درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی

بەوەدا کە ئەو گەردوونە خاوەنێکی هەیە، شتێکی زۆر دەگمەنەو، فیکرێکی زۆر نالۆژیکیی و ڕیزپەڕو وشتیبەو، لەگەڵ زگماك (فطرة)ی مرۆڤ و سەرەتاکانی عەقڵ (المبادىء العقلية)و بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان (البديهيات العقلية)دا دژو ناکۆکە، بۆیەش قورئان کە خوا بەتەرازوو ناردوویەتە خوار:

﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ وَٱلْمِيزَانَ ﴿١٧﴾ ﴾ الشورى.

وشەی (الميزان) چ مەجرووربێ (بالحق والميزانِ)، چ مەنصووب بێ (بالحق والميزانَ)، یانی: (وأنزل الميزان)، بەهەردووك واتایەکەی، یانی: ئەم قورئانە بە تەرازوو هاتۆتە خوار، یاخود: تەرازووی لەگەڵدا هاتۆتە خوار، ئنجا بیکەن بە نیشانە! بە ئەندازەی گرنگیی دانی قورئان بە هەر بابەتێك، ئەو بابەتە گرنگەو، بە ئەندازەی کەمتر باس کردنی، کەمتر گرنگە.

---

ئیلحاد..))یشدا بە وردیی لەو بارەوە قسەمان کردوە، دەشتوانین لەو بارەوە ئاماژەیەکی خێرا بەچەند ئایەتێك بکەین:

١- ﴿ قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِى ٱللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿١٠﴾ ﴾ إبراهيم.

٢- ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الطور.

٣- ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾ طه.

٤- ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ الجاثية.

ئنجا بێگومان ناگونجێ فەرمایشتی تێرو تەواوی خوای زاناو شارەزاو پەنهانزان، لە باسی ئیلحادو مولحیدان خاڵی بێت، کە ئەو هەموو هەراو جەنجاڵەیان هەیە - بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا-و، ئەو هەموو زیان و خراپەیان لێ پشکۆتەتەوە!

شایانی باسیشە ئێمە هەر کام لەو ئایەتانەو هی دیکەشمان لە مەوسووعەی: (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد....)دا بە وردیی توێژیوەتەوەو، چۆنیەتی دەلالەتیانمان لەسەر هەڵوەشاندنەوە ئیلحاد، خستۆتە ڕوو.

زۆرترین گرنگییدانی قورئانیش بە خوا بەیەکگرتن (توحید)و بەرپەرچدانەوەی شیرکە، چونکە گرفت و کێشەی گەورەی بەشەر بریتی بووە لە شیرك و، مامەڵەی هەڵە لەگەڵ خوادا سبحانە و تعالی، نەك دان نەهێنان بە بوونی خوادا، وەك بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگار، ئەمە کێشەیەکی زۆر گەورە نەبووە، بۆیەش پانتایی کەمتری لە قورئاندا بۆ دانراوە.

# باسی دووەم

## بواری خوا پەرستیی

دەگونجێ زۆر بەهای بەرز لەم بوارەدا باس بکرێن، بەڵام بەبۆچوونی من دووانیان لە هەموو بەهایەکان بەرزترن:

**بەهای یەکەم:** خۆ بۆخوا ساغ کردنەوە (الإخلاص)، کردەوەکانی خۆت بۆ خوا ساغ و یەکلا بکەیەوەو، بەشی غەیری خوایان پێوە نەهێڵی و، خڵتەی شیرك و ڕیابازییان تێکەڵ نەبێ.

**بەهای دووەم:** پەیڕەویی کردن (الإتباع) واتە: شوێن کەوتنی وەحیی خوا، شوێنکەوتنی ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

پێچەوانەی ئیخلاص، بریتیە لە شیرك و، ڕیاش هەر جۆرێکە لە شیرك، چونکە هاوبەش کردنی غەیری خوا، لە شتێکدا کە دەبێ بەس بۆ خوابێ، ئەوە واتای شیرکە.

(إتباع) واتە: شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، یان شوێن کەوتنی شەریعەت و بەرنامەی خوا، پێچەوانەکەی بریتیە لە (إبتداع)، واتە: داهێنان لە دیندا، ئەو دووانە، گرفتی هەرە گەورە کە بۆ خوا پەرستیی

دروست دەبێ، لەو دوو ڕێیەوەیە: یان لەڕێی شیرکەوەیە، کە نیازو مەبەستەکە بۆخوا ساغ نەبۆتەوە، پاڵنەرو هاندەرەکە خڵتەی تێکەوتوە، یاخود لەڕێی شوێنپێی هەڵنەگرتنی پێغەمبەرەوەیە (صلى الله عليه وسلم).

خوای بێوێنە دەربارەی ئەوە کە ئێمە تاقی دەکاتەوە: کامەمان کردەوەی باشترە، لە سووڕەتی (الملك) ئایەتی (٢)دا دەفەرموێ:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۝٢﴾ الملك.

واتە: خوا ئەو کەسەیە ژیان و مردنی هێناونە دی، تاکو تاقیتان بکاتەوە: کامەتان کردەوەی باشتر ئەنجام دەدەن!

(فضيل بن عياض) کە نازناوی (أبو علي)یە زانایەکی لێهاتوو بووە، تەعبیرێکی زۆر جوانی بەکار هێناوە، دەڵێ: {(أَحْسَنُ عَمَلًا) أي: أخلصه، وأصوبه} یانی: کامەتان کردەوەکەی ساغترو ڕاسترە! (خالص) واتە: بەشی غەیری خوای پێوە نیە، (صواب)یش واتە: ڕاستە بەپێی شەرعی خوا.

بێگومان ئەوە هەمووی لەبواری خوا پەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوادا، ئەگەرنا لەبواری هەڵس و کەوتە دنیاییەکاندا، مەرج نیە ئێمە چاوەڕێی وەحیی بکەین و، بۆ هەر شتێك دەقێکی شەریعەتمان بەدەستەوە بێ، پێشتر باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە.

خوا سبحانه و تعالى لە زۆر ئایەتەکانی قورئاندا، باسی ئەو دووانە دەکات:

## بەهای یەکەم: باسی بۆ خوا ساغ کردنەوەی کردەوەکان (الإخلاص):

(إخلاص) چاوگ (مصدر)ە: (أخلَصَ، يُخلِصُ، إخلاصاً) لەسەر کێشی (إفعال) ە، (أخلَصَ) واتە: ساغی کردەوە، (يُخلِصُ) ساغی دەکاتەوە، (إخلاصاً) یانی: ساغکردنەوە، (مُخْلِص)یش یانی: ساغکەرەوە، کەسێك کردەوەکانی خۆی بۆ خوا ساغ کردۆتەوە، (مُخْلَص) واتە: ساغکراوە، کەسێك کە خوا ساغی کردۆتەوە، لەسوورەتی (یوسف)دا خوای پەروەردگار مەدحی یوسف دەکات دەفەرمویّ:

﴿ وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ ﴾ یوسف.

خوێنراویشەتەوە (مخلِصين)، هەردووك قیرائەتەکەی هاتوون، ئنجا ئەو دووانە، براو خوشکانی بەڕێز! هەردەم پێکەوەن هەر کەسێ موخلیص بێ بۆ خوا، خواش ساغی دەکاتەوە بۆخۆی و، هەر کەسێ خوا ساغی بکاتەوە، دیارە ئەویش کردەوەکانی خۆی بۆ خوا ساغ دەکاتەوەو، بەشی غەیری خوایان پێوە ناهێڵێ.

با تەماشای هەندێ لە ئایەتەکان بکەین:

١- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلْخَالِصُ ﴿٣﴾ ﴾ الزمر.

واتە: ئێمە کتێبمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە بە هەق، خوا بپەرستە، گەردن کەچیی خۆت بۆ خوا ساغ بکەوە.

لێتان تێك نەچێ! وشەی (دین) لەقورئاندا کە بەکار هاتوە، دەبێ بەپێی سیاقەکەی تەماشا بکرێ، لێرەدا (مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ) مەبەست ئەوە نیە ئیسلام بۆ خوا ساغ بکەیەوە، ئیسلام هەر هی خوایەو بەشی غەیری خوای پێوە نیە، (دین) لێرەدا یانی: ملکەچیی، ملکەچیی خۆت بۆ خوا ساغ بکەوە، بۆ غەیری

خوا ملکەچ مەبە، بەو شێوەیە کە بۆخوا ملکەچی، ملکەچیی ساغ و بێ خلّتە، تەنیا شایستەی خوایە.

٢- خوای بێوێنە بە پێغەمبەری خاتەم (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَـٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾ الزمر.

خوا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەدوێنێ دەفەرموێ: بڵێ: ئەی نەفامەکان! (دیارە دوێنراو موشریکەکانن) ئایا فەرمانم پێ دەکەن جگە لە خوا بپەرستم؟ لە حاڵێکدا کە سروشت بۆ کراوە، بۆ ئەوانەی پێش تۆش نێرراوە، کە ئەگەر هاوبەش بۆ خوا دابنێی، کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوە، لە زیانباران دەبی، بەڵکو تەنیا خوا بپەرستەو لە سوپاسگوزاران بە[1].

٣- هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ﴾ الفاتحە، هەر تۆ دەپەرستین و، داوای یارمەتی هەر لەتۆ دەکەین.

٤- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴿٥﴾ ﴾ البينة.

واتە: فەرمانیان پێ نەکرابوو بەوە نەبێ، کە تەنیا خوا بپەرستن، ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، بەشی غەیری خوای پێوە نەهێڵن.

(حُنَفَآءَ) کۆی (حنیف)ە، (حنیف) کەسێکە لەڕێی ناهەقەوە لایداوە بۆ ڕێی هەق، (حنف) و (جنف) پێچەوانەی یەکدین، ئەو ڕستە موبارەکە هەرکام لە (إخلاص) و (إتباع)ی گرتوونە خۆی.

---

(١) هەر کاتێك (مفعول بە) پێش (فعل) و (فاعل) کەوت، ئەوە کورت هەڵێنان دەگەیەنێ، بۆ وێنە: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ﴾ الفاتحة، بەس تۆ دەپەرستین و، بەس پشت بەتۆ دەبەستین، ئەوە کورت هەڵێنان، دەگەیەنێ، لێرەش ڕستەی: {بَلِ اللهَ فَاعْبُدْ} بەهەمان شێوەیە.

## بەهای دووەم: شوێنپێ هەڵگرتن (الإتباع):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە کە دەبێ بەپێی شەریعەتی خوا بەڕێوە بچین و، دینداریی و خوا پەرستییمان دەبێ تەنیا بەو پێیە بێ، کە خوا فەرموویەتی و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فێری کردووین، زۆر فەرموودەی هەن، بۆ نموونە:

١- {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ منه، فَهُوَ رَدٌّ} أخرجه البخاري برقم: (٢٥٥٠)، و مسلم برقم: (١٧١٨).

واتە: هەر کەسێ لەم ئایینەی ئێمەدا، شتێك پەیدا بکات کە پێی بێگانە بێ و لێی جیا بێ {واتە: شتێك دابهێنێ} ئەوە ڕەت کراوەیەو بەسەری دادەدرێتەوە.

زانایان دەڵێن: {فِي أَمْرِنَا هَذَا} واتە: لەڕووی دینداریی و عیبادەت و مامەڵە لەگەڵ خواوە، ئەدی لەڕووی دنیاداریییەوە؟ پێشتر باسمان کردوە، کە وەك چۆن ئەصڵ لە دینداریيدا بریتیە لە شوێنکەوتن (إتباع)، ئەصڵ لەدنیاداریيشدا بریتیە لەداهێنان (إبداع)، چونکە مامەڵە لەگەڵ خوادا، بەس خواو پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەزانێ دەبێ چۆن بێ! بەڵام مامەڵە لەگەڵ دنیادا، خۆشمان سەرمان لێ دەردەچێ، بۆیە خوا سبحانە و تعالی لەو بوارەدا بە دانانی چەند هێڵێکی گشتی، ئیکتیفای کردوە.

٢- هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا، پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ } أخرجه أحمد برقم (٢٥١٧١)، ومسلم برقم (١٧١٨).

واتە: هەرکەسێك کردەوەیەك بکات، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ، ئەوە ڕەتکراوە (مرفوض)ە.

٣- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژی کردوە لەبەر چاوی هاوەڵانی و فەرموویەتی: {وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي} أخرجه أحمد برقم (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم (٧٨٥)، ومسلم برقم (٦٧٤)، والنسائي برقم (٦٣٥)، وابن حبان برقم (١٦٥٨).

واتە: نوێژ بکەن، وەك چۆن منتان بینی نوێژم کرد.

هەروەها حەجی کردوەو بەهەمان شێوەی فەرمووە: {لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَناسِكَكُمْ} أخرجه مسلم برقم (١٢٩٧)، واتە: خوا پەرستییەکانم لێوەربگرن.

ئەوە بزانن خوێنەرانی بەڕێز! لەبواری خوا پەرستییدا، چ بەملادابچی، چ بەولادابچی، هەر لادانە، ئنجا شیعەو زۆرێك لە ئەهلی تەصەووف لەبواری مامەڵە لەگەڵ خوادا، چ لەڕووی تیۆریی و فیکرییەوە، وەك: ئیمان و پاڕانەوە لەخوا، چ لەبواری کردەییدا، لادان و بیدعەتی زۆریان هێناوەتە نێو ئیسلام:

١- ئەگەر تەماشای شیعە بکەین: زۆربەیان هەتا قەبری ئیمامەکانیان لەوێ بێ، ناپەرژێنە سەر ئەوەی لەخوا بپاڕێنەوە! هەروەها تاکو حەسەن و حوسەین و عەلیی و فاتیمە خوا لێیان ڕازی بێ، لەوێ بن، ناپەرژێنە سەر ئەوەی لە خوا بپاڕێنەوە!

٢- زۆرێك لە ئەهلی تەصەووفیش، لەڕووی تەقدیسی شێخەکانیانەوە، وان، جارێك سەردانی ناوچەی بیتوێن و پشدەرم کرد، چوومە ماڵی خزمێك، خەڵکی گوندەکە لەوێ نەبوون، گوتم: خەڵکەکە لە کوێن؟ گوتیان: خەڵکەکە هەموویان چوونەتە دەرێ {ڕۆژی نەورۆز بوو} گوتم: بۆ کوێ چوون؟ ئەوانیش ناوی دێیەکیان هەڵدا، گوتم: بۆچی چوون بۆ ئەوێ؟ گوتیان: شوێنێکی خۆشەو ئیمانداریشی لێن[1]، منیش گوتم: ئەگەر لەوێ ئیمانداری مردووی لێن، ئێمە ئیمانداری زیندووین!

---

(١) لەو دەڤەرە بە گۆڕی پیاوچاکان دەگوترێ: ئیماندار!

بەهەرحاڵ ئیمانداران لەلای خوا بەڕێزن، بەزیندوویی و بە مردوویی، بەڵام مەبەستم ئەوەیە: لەڕێی بە پیرۆزو بەمەزنگرتن (تقدیس و تعظیم)ی پێشینان و ئەوانە کە ڕۆیشتوون، لێرەوە شیرك و بیدعەت سەر هەڵدەدەن، هەڵبەتە هەم شیعەو هەم صۆفییش خەڵکی خوا پەرست و ساغیشیان تێدا هەیە، بەڵام بەڕاستیی لەو دوو ڕێیەوە: شیعەگەریی و صۆفیگەریی، بیدعەت و شیرك و خڵتە و خاڵی زۆر هاتۆتە نێو ئیسلامەوە.

# باسی سێیەم

## بواری زانیاریی و زانست
## (العلم و المعرفة)

براو خوشکانی بەڕێز! پێم وایە لەم بوارەدا سێ بەهای زۆر بەرز هەن، کە پێویستە مرۆڤی مسوڵمان و کۆمەڵگای مسوڵمان، خۆیانیان پێ بڕازێننەوە:

### بەهای یەکەم:

### سەرنجدان و تێفکرین و لێکۆڵینەوەو، فڕێدانی لاسایی کردنەوەو دەمارگیریی:

ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، دەبینین: زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە: کە تێبفکرین و سەرنج بدەین و ڕابمێنین و، خۆمان دوور بگرین لە لاسایی کردنەوەی خەڵك، خەڵك قسەیەکیان کردوە ئێمەش هەمان قسە بکەین، وەك تووتیی (ببغاء)، هەروەها خۆمان بەدوور بگرین لە دەمارگیریی (تعصُّب) کە هەر کات بیرۆکەیەکمان لەلا گەڵاڵە بوو، هەتا قیامەتێ لەسەری بین! نەخێر، بەڵکو ئەگەر شتی باشتر هەبوو، لەجێی ئەوەی خۆمانی دابنێین، وەك

ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێبێ دەیگوت: {ئەو فیقهە بۆچوون (رأي)ە، هەر کات کەسێك ڕایەکی باشترمان بۆ بێنێ، لە شوێنی هی خۆمانی دادەنێین} بەڕاستیی ئا ئەوە ئازایەتییە، هەم ئازایەتییە، هەم ئازادییە، کە ئینسان بتوانێ دەستبەرداری بیرۆکە هەڵەکانی خۆی ببێ، هەر کات ڕاو بۆچوونی لەوانی خۆی چاکتری لێ هەڵکەوت.

با لەو بارەوە سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین:

١)- خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴿١٠١﴾ ﴾ یونس، واتە: بڵێ سەرنج بدەن! چی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە {سەرنج بدەن! تێبفکرن! تێڕامێنن!}.

٢)- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەتە موڵکی فراوانی ئاسمان و زەوی و، هەر شتێ کە خوا دروستی کردوە! سەرنجیان لێ نەداوە؟

٣)- دەربارەی سەرنج دان و تێوەڕامانی قوڕئانیش، خوای بەرزو بێوێنە دەفەرموێ: ﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص.

واتە: ئەم قوڕئانە کتێبێکە بۆ لای تۆمان ناردۆتە خوار، بە پیت و پێزە بەبەرەکەتە، بۆ ئەوەی لە ئایەتەکانی ڕامێنن و، بۆ ئەوەش کە خاوەن عەقڵان پەند وەربگرن و بیریان بکەوێتەوە.

بەڵێ سەرنج دان و تێفکرین و ڕامان، بەهایەکی زۆر بەرزە، لەبواری زانیاریی و مەعریفەتداو، لەڕێگای ئەوەشەوە، ئینسان دەستی لە زانیاریی و زانست گیر دەبێ و، لە هەڵە دەپارێزرێ و، خۆیشی دوور دەگرێ لە لاسایی کردنەوەی کوێرانە، ئەگەر دەقێکی شەرعیی هەبێ، ئەوە جیایە، بەڵام لەبواری بۆچوون و بیروڕادا، ئینسان دەبێ عەقڵی خۆی بکاتە بێژینگ، نەك بیکاتە سەبەتە، سەبەتە: هەرچی تێی بکەی وەریدەگرێ، بەڵام بێژینگ: کاو دان، دانەوێڵەو سەرکوێژر، لێك جیا دەکاتەوە.

بەهای دووەم:

مرۆڤ دەبێ بەبێ زانیاریی و بەرچاو ڕوونیی، مل لە هیچ شتێك نەنێ و بەدوای هیچ شتێك نەكەوێ:

ئەمەش چەند ئایەتەێك لەو بارەوە:

١)- خوای پەروەردگار نەهی لێكردووین كە بەبێ زانیاریی بەدوای شتێك بكەوین، دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: هەر شتێك زانیارییت دەربارەی نیە، شوێنی مەكەوە، چونكە بیستن و دیتن و عەقڵ، هەر كامێك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە {ئایا ئەركەكەی خۆی پێ ئەنجام دراوە، یان نا}؟

٢)- هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟ ﴿٩٤﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر بەڕێی خوادا ڕۆیشتن (واتە: چوون بۆ جەنگ و جیهاد) بەرچاوی خۆتان ڕوون بكەنەوە {هەروەها خوێنراویشتەوە {فتثبّتوا} واتە: تەحقیقی لێ بكەن}.

بەڵێ: لێی بكۆڵەوەو هەر لەخۆڕا مل لێمەنێ و، بەپێخواسیی بەنێو مەكەوە.

٣)- هەروەها خوای پەروەردگار باسی قسەی جوولەكەو نەصرانییەكان دەكات و بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١﴾ البقرة.

واتە: {جوولەکەو نەصڕانییەکان} گوتیان: مەگەر ئەوەی جوولەکە یان نەصڕانیی بێ، ئەگەرنا ناچێتە بەهەشت، ئەوە هەر خۆزگەی خۆیانە، بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن، بەڵگە بێنن. واتە: بەبەڵگە دەردەکەوێ: کە ئەو قسەیە ڕاستە، یان ڕاست نیە.

٤)- پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکراوە، کە ڕایبگەیەنێ خۆی و شوێنکەوتووانی بەبەرچاو ڕوونییەوە بانگەواز بکەن:

﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٨﴾ يوسف.

واتە: بڵێ: ئا ئەمە ڕێبازی منە، خۆم و ئەوانەی شوێنم کەوتوون، لەبەر ڕۆشناییدا بانگەواز بۆ لای خوا دەکەین.

بەهای سێیەم:

ڕێزلێگرتنی زانایان و پسپۆڕان و[1] پابەندیی بە فێرکردن و ئاراستە کردنیانەوە:

با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

١)- لە سووڕەتی (النحل)و لە سووڕەتی (الأنبیاء)یشدا، خوای کاربەجێ ئەم ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ۝٧﴾ الأنبیاء، النحل (٤٢).

{أَهْلَ ٱلذِّكْرِ) شارەزایان، (ٱلذِّكْرِ) بەمانای زانست دێ و، بەمانای کتێبی خوای پەروەردگاریش دێ، کتێبی خوای پەروەردگاریش زانستی خوایە} واتە: لە شارەزایان بپرسن، ئەگەر نازانن.

لەچیدا لێیان بپرسین؟ هەر زانایەك لەبواری خۆیدا، زۆرجار مامۆستایانی ئایینی ئەم { أَهْلَ ٱلذِّكْرِ}ە، هەر بەخۆیان دەزانن! بەڵام وانیە، پزیشکەکان لەبواری خۆیاندا (أَهْلَ ٱلذِّكْرِ) ن، هەروەها ئەندازیاران لە بواری خۆیانداو، یاساناسان لەبواری خۆیانداو، گەردووناسان لەبواری خۆیانداو... هتد، پرسیارێکی شەرعییت بوو، دەبێ لە زانایان بپرسی، بەڵام بۆ مەسەلەیەکی تەندروستیی، دەبێ لە پزیشکان بپرسی و، ...هتد.

٢)- هەروەها لە سووڕەتی (المجادلە)دا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَـٰلِسِ فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ۝١١﴾، ئەوەی لێرەدا شوێنی مەبەستە ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ:

---

(١) مەبەست لە زانایان و پسپۆڕان واتە: لە هەموو بوارەکاندا.

خوا ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوە بەرزیان دەکاتەوەو، ئەوانەش کە زانیارییان پێ دراوە، بەچەندان پلە.

(أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ) واتە: خاوەن زانست، لە هەر بوارێکدا، بابای شارەزا دەبێ پرسی پێ بکرێ و، ڕێز لە شارەزاییەکەی بگیرێ.

٣)- لە سوورەتی (النساء)دا خوا فەرمان دەکات بە ئەهلی ئیمان، کە دەبێ بگەڕێنەوە بۆ پسپۆڕان و شارەزایان و، ئەوانەی کە توانای ئیجتیهادو هەڵهێنجانیان هەیەو، دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٌ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنۡهُمۡ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسۡتَنۢبِطُونَهُۥ مِنۡهُمۡۗ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾ ﴾

لێرەدا خوای کاربەجێ ڕەخنە دەگرێ لە کۆمەڵێکی دڵنەخۆش و ئیمان لاواز، دەفەرموێ: کاتێ هەواڵێکی جێی دڵنیایی یان جێی ترسیان بۆ دەهات، یەکسەر بڵاویان دەکردەوە، بەڵام ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر {(صلی الله علیه وسلم)} و، بۆ لای کاربەدەستان، ئەوانەی کە توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی {کە ئایا ئەو هەواڵە بڵاو بکرێتەوە یان بڵاو نەکرێتەوە، ڕاستە یان ڕاست نیە؟} کەواتە: دەبووایە بگەڕێنەوە بۆ لای خەڵکی پسپۆڕو شارەزا.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ لَٱتَّبَعۡتُمُ ٱلشَّيۡطَٰنَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٣﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەگەر بەخشش و بەزەیی خوا نەبووایە لەسەر ئێوە، کەمێکتان نەبێ، هەمووتان بەدوای شەیتان دەکەوتن.

ئەم ڕستە قورئانییە دەری دەخات کە هەر کەسێ نەگەڕێتەوە بۆ لای شارەزایان، کە پرسیان پێ بکات و لێیان بەهرەمەند بێ، مانا وایە کەم و زۆر لەژێر کاریگەریی شەیتان دایە.

# باسی چوارەم

## بواری حوكم و سیاسەت

لەم بوارەشدا دوو بەهای بەرزمان هەڵبژاردوون:

**بەهای یەکەم:**

**حوکمکردن بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار** (الحُكم بِما أَنزَلَ الله).

**بەهای دووەم:**

**هێنانە دی و چەسپاندنی دادگەریی** (تَحقيق العَدل وتَثْبيتُهُ).

كە بێگومان چەسپاندنی دادگەرییش بەرهەمی حوكم كردنە بەوە كە خوا دایبەزاندوە، هیچ گومانی تێدا نیە، لە كۆمەڵگایەكدا شەریعەتی خوا پیادە بكرێ و، كاری پێ بكرێ، دادگەریی دێتە دی، لەبەر چی؟!

زۆر كەس ئەو قسەیەی بە گشتیی بیستوە، بەڵام وردی نەكردۆتەوە، لەبەرچی دادگەریی تەواو، تەنیا لەژێر سێبەری شەریعەتی خوادا دێتە دی؟ ئنجا ئێستا تۆزێك وردی دەكەینەوەو دەڵێین:

براو خوشکانی بەڕێز! مرۆڤ هەرچی بێ، هەر مرۆڤە، تەنانەت پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لەسەر بێ، خوا ئاگای لێیان بووەو پاراستوونی، ئەگەرنا مرۆڤ مرۆڤەو، دەکەوێتە ژێر کاریگەریی عاتیفەوەو شەیتان وەسوەسەی بۆ دەکات، وەك خوا بە دەقی ئایەت دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الأنعام.

خوا بەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: ئەگەر ئەوانەت بینی کە دەڕژێنە نێو ئایەتەکانی ئێمە {واتە: تانەیان لە ئایەتەکانمان دەداو کوفریان پێ دەکردن و گاڵتەیان پێ دەکردن} پشتیان تێبکە، لەگەڵیان دامەنیشە، هەتا دەچنە نێو بابەتێکی دیکە، هەر کاتیش شەیتان لەبیری بردیەوە {کەواتە: پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەگونجێ شەیتان شتی لەبیر بەرێتەوە} دوای ئەوەی بیرت دێتەوە، لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاران دامەنیشە.

بەشەر وەك چۆن حوکمی عەقڵ کاری تێ دەکات، عاتیفەو غەریزەکان، دەورو بەرو، کۆمەڵگاو شەیتانیش، کەم و زۆر کاری تێدەکەن.

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (ص)دا لە شەش ئایەتدا (٢١-٢٦) باسی بەسەرهاتێکی پێغەمبەر داوود سەلامی خوای لێبێ دەکات، کە بەداخەوە زۆر لە تەفسیرەکان، لێکدانەوەیەکی زۆر هەڵەیان بۆ کردوە، کە من لە {موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله}دا[١]، ڕوونم کردۆتەوە هەقیقەتەکەی چۆنە!

گوایە داوود نەوەدو نۆ (٩٩) هاوسەری هەبووە، کابرایەك هاتوە بۆ لای، یەك خێزانی هەبووە، ئەویش تەماعی تێکردوە کە ئەو خێزانەشی لێ داگیر بکات و هی وی ببنە (١٠٠) و کابراش هیچی نەمێنێ، زۆر عەجایبە! هەندێ لە تەفسیرەکان کە ئەو شتانە بڵاو دەکەنەوە، چاك لێی ورد نەبوونەتەوە، ئەگەرنا مسوڵمانێکی سادەی عەوام، ئەوە لەخۆی ناوەشێنێتەوە، چ جای پێغەمبەرێکی

---

(١) بڕوانە: (الكتاب السادس: الإيمان برسل الله وأنبيائه الكرام)، ط٢/ ٢٠١٨م.

پایە بەرز، ئەو بەسەرهاتەش لە {پەیمانی کۆن} دایە کە بێگومان دەستکاریی کراوەو گۆڕاوە، کە گوایە: کابرایەك هەبووە ناوی (ئوریا) بووەو هاوسەرێکی هەبووە زۆر جوان بووە، داوود سەلامی خوای لێبێ، چاوی پێکەوتوەو کابرای ناردۆتە پێشەوەی بەرەکانی جەنگ، هەتا کابرای بە کوشت داوە، ئنجا ژنەکەی مارە کردۆتەوە(١)!! خواش دوو فریشتەی ناردوون بۆ ئەوەی بۆ داوودی دەربخەن کە بەهەڵەدا چووە، لەسەر شێوەی دوو کەس، یەکیان گوتوویەتی: ئەو برایەم نەوەدو نۆ (٩٩) سەر مەڕی هەیە، منیش یەك سەر مەڕم هەیە، پێم دەڵێ: مەڕەکەی خۆشت بدە بەمن، ئنجا بەقسە بەسەریشمدا زاڵبووەو، پێی سەلماندووم کە من مەڕەکەی خۆشم بدەم بەوی، هی وی ببنە سەد (١٠٠)و، منیش هیچ مەڕم نەمێنن!!

بەڵام لە قورئاندا هەر ئەوەندە هەیە کە خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَهَلْ أَتَىٰكَ نَبَؤُا۟ ٱلْخَصْمِ إِذْ تَسَوَّرُوا۟ ٱلْمِحْرَابَ ﴿٢١﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنْهُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ خَصْمَانِ بَغَىٰ بَعْضُنَا عَلَىٰ بَعْضٍ فَٱحْكُم بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَلَا تُشْطِطْ وَٱهْدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ هَٰذَآ أَخِى لَهُۥ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ نَعْجَةً وَلِىَ نَعْجَةٌ وَٰحِدَةٌ فَقَالَ أَكْفِلْنِيهَا وَعَزَّنِى فِى ٱلْخِطَابِ ﴿٢٣﴾ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ﴿٢٤﴾ ﴾ ص.

واتە: ئایا باس و خواسی دەمەقاڵێیکەرەکانت پێنەگەیشتوە، کە بەسەر دیواری میحراب (میحرابەکەی داوود)دا سەرکەوتن!

کاتێك لێی وەژوور کەوتن و ئەویش بیمی ڕێنیشت، گوتیان: مەترسە! ئێمە دوو لایەنی ناکۆکین یەکمان ستەمی لەوی دیکە کردوە، تۆش دادگەرانە دادوەرییمان لەنێواندا بکەو، لامەدەو ڕێنماییمان بکە بۆ ڕاستە ڕێ.

ئائەمە برامە نەوەدونۆ مەڕی هەیەو، منیش یەك مەڕم هەیە، کەچی گوتی: ئەویش بدە بەمن و بە قسەش بەسەرمدا زاڵ بوو.

---

(١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر صموئيل الثاني، الإصحاح:١١، (خطيئة داود وخِداعهُ) ص ٦٥٩-٦٦١.

داوود گوتی: بێگومان بەوە کە داوای لێکردووی مەڕەکەت بخەیە پاڵ مەڕەکانی، ستەمی لێکردووی..

سیاقی ئایەتەکان تەماشا بکەن! لەگەڵ ئەو حیکایەتەی پەیمانی کۆندا هەر ناگونجێ، ئنجا وەك گوتمان: ئەصڵەن ئەو حیکایەتەی کە دەگوترێ، شایستەی مسوڵمانێکی ئاسایی نیە، چ جای شایستەی پێغەمبەرێکی پایە بەرز بێ!! ئنجا ئەوەی قورئان باسی ژن و هاوسەری هەر تێدا نیە، ئەدی قەزیەکە چییە؟ دوایێ دەزانین، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٌ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾ ص.

واتە: ئەی داوود! ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین لەسەر زەوی و، حوکم بەهەق بکەو، بەدوای ئارەزوو مەکەوە {واتە: هەست و سۆز}، ئەگەرنا لەڕێی خوا لات دەداو لەڕێی خوات ون دەکات.

شایانی باسیشە پوختەی مەبەست، کە ئایەتەکان زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنن و عەقڵی سەلیم و سروشتی ساغیش بە ئاسانیی هەزمی دەکەن، بەمجۆرەیە:

خوا سبحانە و تعالی داوودی تاقی کردۆتەوە، کــە داوود وێڕای پێغەمبەرایەتیی پادشاش بووەو پاسەوانی هەبوون، ئنجا لە کاتێکدا داوود سەلامی خوای لێبێ لە ژووری تایبەتیی خۆیدا دەبێ، دوو فریشتە دێن، فریشتەش لە پاسەوانان ناوەستن، ڕاستەوخۆ دەچنە ژوورو، داوودیش ترساوەو، ئەوانیش نەیانگوتوە: ئێمە فریشتەین، گوتوویانە: دوو کەسین ناکۆکییمان هەیەو هاتووین بۆ لات، گوتوویەتی: ناکۆکییەکەتان چییە؟ یەکیان گوتوویەتی: ئێمە هەردووکمان براین، ئەم برایەم نەوەدو نۆ (٩٩) سەر مەڕی هەیە، منیش یەك (١) سەر مەڕم هەیە، پێم دەڵێ: مەڕەکەی تۆش دەبێ هی من بێ و بە قسانیش بەستوومیەوەو بەزاندوومی!! ئیدی کێشەکە ئەوەندە وورووژێنەر بووە، داوود لەبیری چووە بڵێ: باشە تۆ داواکار

(مدّعي)ی، باداوا لەسەر کراو (مدّعي عليه)یش بدوێنم، بزانم داخۆ ڕاست دەکەی، ڕاست ناکەی؟! وەك گوتراوە: ئەگەر کەسێك چاوێکی لەسەر دەست بوو بۆ لات هات، مەڵێ: ستەم لێکراوی، هەتا بەرامبەرەکەشی نەبینی، لەوانەیە ئەو هەردووك چاوەکانی هاتبنە دەرێ، یەکسەر داوود سەلامی خوای لێبێ فەرمووی:

﴿ قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ ۖ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ ۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴿٢٤﴾ ﴾ ص.

واتە: بەڕاستی زوڵمی لێکردووی کە مەڕەکەی تۆ دەخاتە پاڵ مەڕەکانی خۆی و، زۆرێك لەوانەی تێکەڵن و هاوبەشن، زوڵم لەیەکدی دەکەن، جگە لەوانەی ئەهلی ئیمانن و کردەوەی باش دەکەن، ئەوانیش زۆر کەمن.

دوایی دوو فریشتەکە تەماشای یەکدییان کردو پێکەنین، ئنجا داوود سەلامی خوای لێبێ بۆی دەرکەوت مەسەلە چیە؟ (وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ) {(ظنَّ) لێرەدا بەمانای (عَلِم)ە} یانی: داوود بۆی دەرکەوت کە ئێمە تاقیمان کردەوە، بۆیە یەکسەر سەجدەی بردو گەڕایەوە (بۆ لای خوا).

ئنجا ئایا خوا فەرموویەتی: ئەی داوود! تەماح لە ژنی خەڵکی مەکە؟ نا، بەڵکو پێی دەفەرموێ:

﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٦﴾ ﴾ ص.

ئیدی تەعقیبەکە چۆنە، بەسەرهاتەکەش ئاوایە، واتە: ئەی داوود! ئێمە تۆمان کردوە بە جێنشین لەسەر زەوی، حوکم بە هەق بکەو بەدوای عاتیفە مەکەوە، ئەگەرنا لەڕێی خوا لات دەدا، ئەوانەش کە لەڕێی خوا لادەدەن، سزای سەختیان هەیە، چونکە ڕۆژی لێپرسینەوەیان فەرامۆش کردوە.

ئێستاش با بگەڕێینەوە سەر ئەصڵی مەبەست: ئایا لەبەرچی تەنیا بەرنامەو حوکمی خوا دادگەریی بەرهەم دێنێ؟

دەڵێین: لە سۆنگەی ئەوەوە کە تەنانەت پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێ، شەیتان لەبیریان دەباتەوەو، دەکەونە ژێر کاریگەریی دەورو بەر، دەکەونە ژێر کاریگەریی عاتیفە، بەڵام خوای بێوێنە، پاکە لە هەرچی کەم و کوڕییەو، هەرچی سیفەتی بەرزە، هەیەتی، نە ئینتیمای نەتەوەیی هەیە، نە ئینتیمای ڕەگەزیی هەیە، نە ئینتیمای بەباری سەروەت و ساماندا هەیە، خوا خوایە، بۆ پیاوو ئافرەت، بۆ نێرو مێ، بۆ هەژارو دەوڵەمەند، بۆ دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵات، بۆ گەورەو گچکە، بۆ ڕەش و سپی، بۆ هەمووان وەك یەکە، ئنجا شەریعەتێك ئەو خوایە دایبنێ، لایەنگیریی بەلای کەس دانیەو، دادگەریی ڕەهای تێدایە.

بەڵام بەرنامەکانی دیکە:

١- یان دەوڵەمەند دای دەنێ، وەك کاپیتالیزم و بە قازانج و سوودی چینی بورژواو بە زیانی چینی هەژار تەواو دەبێ،

٢- یان چینی کرێکار دایدەنێ، وەك سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم و، بە قازانجی چینی پرۆلیتارو، بەزەرەری چینی دەوڵەمەند تەواو دەبێ.

٣- یان عەرەب دایدەنێ، بەزەرەری عەجەم[1].

٤- یان عەجەم دایدەنێ بە زەرەری عەرەب.

٥- یان ڕەش دایدەنێ، بەزەرەری سپی.

٦- یان سپی دایدەنێ، بەزەرەری ڕەش.

٧- یان پیاو دایدەنێ، بەزەرەری ژن.

٨- یان ژن دایدەنێ بەزەرەری پیاو.

بەڵام ئەگەر خوا داینا، ئەوە شەرع سالارییەو، شەرعی خوا بۆ هەمووان وەك یەکە، بەڵکو شەریعەتی خوا لەبواری قەزاوەتدا - وەك دوایی باسی دەکەین - جیاوازیی بە کافرو مسوڵمانیش ناکات، بەڵێ دادگەریی ڕەها تەنیا لەشەریعەتی خوادا دەست دەکەوێ.

---

(١) عەجەم واتە: غەیری عەرەب، بەگشتیی.

با تەماشای هەندێ ئایەت بکەین، لەو بارەوە کە حوکم تەنیا شایستەی خوایەو لەسەر کۆمەڵگاو دەوڵەتێکی ئیسلامییش پێویستە حکوم بەو بەرنامەیە بکەن کە خوای کاربەجێ و دادگەر دیبەزاندووە:

١- خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف.

واتە: حوکم تەنیا هی خوایە، ئەم (إن)ە، (إن)ی (نافية)یە، یانی: {ماالحكم إلا لله}، حوکم لێرەدا وێڕای دادوەریی (قضاء) و بڕیاردانی ڕەهای تەکوینیی، بەمانای بەرنامە دانان و، دیاریی کردنی حەڵاڵ و حەڕام و، چاك و خراپیش، دێ ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف، خوا فەرمانی کردوە کە تەنیا ئەو بپەرستن ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾ یوسف، واتە: ئا ئەوە دینی ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

٢- لە سووڕەتی (المائدة) ئایەتی (٥٠)دا دەفەرموێ: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾﴾.

واتە: ئایا حوکمی نەفامیی دەخوازن، ئنجا ئایا حوکمی کێ لەهی خوا چاکترە، بۆ کەسانێك کە زانیاریی تەواویان هەبێ و دڵنیابن.

٣- لەو بارەوەش کە دادگەریی تەنیا لەژێر سایەی شەریعەتی خوادا دەچەسپێ، خوای سبحانە و تعالى دەفەرموێ:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِٱلْبَيِّنَـٰتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلْقِسْطِ ﴿٢٥﴾﴾ الحديد.

واتە: بە دڵنیایی هەموو پێغەمبەرانمان ناردوون بەبەڵگە ئاشکرایەکانەوە، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردوونە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوە بچێ....

ئنجا بەتەئکید خوا ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێبێ، بنێرێ بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە، کە بریتیە لە بەرپا کردنی دادگەریی، دەبێ ئەو پێغەمبەرانە، بتوانن ئەو دادگەرییە بێننە دی و، ئایین و بەرنامەکەیان ئەوەی لەباراندا هەبێ.

# باسی پێنجەم

## لە بواری دادوەریی (قضاء)دا

لەبواری دادوەرییدا دوو بەهای بەرز هەن، کە دەبێ مسوڵمانان خۆیانیان پێ برازێننەوە:

**بەهای یەکەم:** یەکسان کردنی لایەنە ناکۆکەکان و، بەیەکسانیی مامەڵەیان لەگەڵدا کردنیان.

**بەهای دووەم:** پەنا بردنە بەر شەریعەتی خوا بۆ دادوەریی.

### بەهای یەکەم: یەکسان کردنی لایەنە ناکۆکەکان:

خوا عز وجل لەو بارەوە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئێمە کتێبمان بەهەق بۆ تۆ دابەزاندوە، تاکو بەوەی کە خوا پێشانت دەدا، دادوەریی لەنێوان خەڵکدا بکەی و، مشتومڕیش لەسەر خائینان مەکە، بەرگرییان لێ مەکە.

ئەم ئایەتە هەتا (٩) ئایەت، لە (١٠٥) تاکو (١١٣) لە سوورەتی (النساء) هەمووی بۆ بەرگریی کردن لە جوولەکەیەکی ستەملێکراو[1] دابەزیون، کە تۆمەتی دزیی پاڵدرابووە لاو دزییشی نەکردبوو، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئاگای لێنەبوو کە دزیی نەکردوە، لەبەر ئەوەی شتەکە لەماڵی ئەواندا ئاشکرا بووبوو، بۆیە خەریك بوو سزای بدا، خوای دادگەریش لەسەرووی حەوت ئاسمانانەوە وەدەنگ هات و ئەو نۆ (٩) ئایەتەی دابەزاندن، بۆ بەرگریی کردن لە جوولەکەیەکی ستەملێکراو، ئنجا ئایا جگە لە ئیسلام لەکوێدا شتی وا چنگ دەکەوێ، هەڵبەتە جوولەکەش لەو کاتەدا لە گەرمەی پیلانگێڕیی دابوون لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان!

ئەمەش دەقـی ئەو نۆ (٩) ئـایەتە موبـارەکە، کە لەبەرگی سـێیەمی {تەفسیری قورئانی بەرێز و بەپێز} دا، کە بۆ تەفسیرکردنی سوورەتی (النساء) تەرخانکراوە بەدرێژیی قسەمان لەبارەوە کردوون:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴿١٠٥﴾ وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ﴿١٠٧﴾ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿١١٢﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴿١١٣﴾ ﴾ النساء: ١٠٥ - ١١٣

---

(١) بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١، ص ٤٩٣-٤٩٥، أخرجه الترمذي: ٣٠٣٦، وابن أبي عاصم في (الآحاد والمثاني): ١٩٥٨، والطبراني في (المعجم الكبير): ١٥....، وغيرهم كثير، وقال مؤلفا الإستيعاب: {... فالحديث يرتقي بمجموعها لدرجة الحسن لغيره},

بەهای دووەم: پەنا بردنە بەر شەریعەتی خوا بۆ دادوەریی:

لەو بارەوەش کە دەبێ دادوەریی بردن (تحاكم) تەنیا بۆ لای شەریعەتی خوا بێ، خوا سبحانه و تعالى دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾﴾ النساء.

واتە: ئایا تەماشای ئەوانە ناکەی کە پێیان وایە {واتە: وانین، بەڵام پێیان وایە} بڕوایان هێناوە بەوەی کە بۆتۆ دابەزێنراوە، بەوەش کەلەپێش تۆدا دابەزێنراوە، کەچی دەیانەوێ دادوەریی خۆیان بەرنە لای تاغووت، لە حاڵێکدا فەرمانیشیان پێکراوە کە کوفر بە تاغووت بکەن، شەیتانیش دەیەوێ بە گومڕاییەکی دوور گومڕایان بکات.

هۆی هاتنە خوارەوەکەی: {عن بن عباس قال: كان أبو برزة الأسلمي كاهناً يقضي بين اليهود فيما يتنافرون إليه، فتنافر إليه ناس من المسلمين، فأنزل الله عز وجل: {ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك وما أنزل من قبلك يريدون أن يتحاكموا الى الطاغوت وقد أُمروا أن يكفروا به إلى قوله إن أردنا إلا إحساناً وتوفيقاً}أخرجه الطبراني في معجمه الكبير ج١١/ص٣٧٣.

ئیبن و عەبباس دەگێڕێتەوە: کە ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی کاهینێکی جوولەکە بووە، جوولەکەکان دادوەریی خۆیان دەبردە لای ئەو، هەندێ لە مسوڵمانان مشت و مڕێکیان بوو، چوون بۆ لای ئەبو بەرزەی ئەسلەمیی {کە خوا ناوی لێ ناوە تاغووت، چونکە هەر کەسێ دادوەریی لەنێوان خەڵکدا بکات بەبێ شەریعەتی خوا، ئەوە بە تاغووت لەقەڵەم دەدرێ} خواش عز وجل ئەو ئایەتانەی دابەزاندن لەو بارەوە.

# باسی شەشەم

## لەبواری کۆمەڵایەتییدا

لەبواری کۆمەڵایەتییدا گەلێك بەهای بەرز هەن، کە ئێمە چواریانمان لێ بەنموونە هێناونەوە:

{الإحسان، التراحم، التعاون، التكافل}.

### ١- چاکەکاریی (الإحسان):

چاکەکاریی خوڵاصەی مانایەکەی ئەوەیە کە سوود بە خەڵك بگەیەنرێ، سوودی ماددیی یاخود مەعنەویی، خوای پەروەردگار لەزۆر شوێندا ستایشی چاکەکاران (مُحسنین)ی کردوە، بۆ وێنە:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾ الذاريات.

واتە: بەدڵنیایی پارێزکاران لەنێو باغ و سەرچاوان دان، ئەو (پاداشت)ەی پەروەردگاریان پێیداون وەریدەگرن، چونکە پێش ئەوە چاکەکار بوون، کەمێك نەبێ لە شەوگاردا نەدەخەوتن، دەمەو سەحەرانیش داوای لێبوردنیان (لەخوا) دەکرد، لەماڵ و سامانیشیاندا مافی سواڵکەرو بێبەشان، هەبوو.

٢- چاکەکاریی بەهایەکی زۆر بەرزەو، ئیماندار ناتوانێ چاکەکار نەبێ، لەگەڵ هەموو کەسدا (کافرو مسوڵمان) لەبواری هەڵس و کەوتدا، چونکە خوا بەرِەهایی باسی کردوە:

﴿وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ١٩٥﴾ البقرة، واتە: چاکەکار بن، خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن.

٣- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ كَتَبَ الإِحْسَانَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ} أخرجه أحمد برقم (١٧١٥٤)، والدارمي برقم (١٩٧٠)، ومسلم برقم (١٩٥٥)، وأبو داود برقم (٢٨١٥)، والترمذي برقم (١٤٠٩)، وقال: حسن صحيح، وابن أبي شيبة برقم (٢٧٩٢٩)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٠٧١)، وأخرجه أيضا: النسائي برقم (٤٤٠٥)، وابن ماجه برقم (٣١٧٠)، والطبراني برقم (٧١١٤)، والبزار برقم (٣٤٦٨)، والديلمي برقم (٦٤٨).

واتە: بێگومان چاك ئەنجامدانی بۆ هەر ئیش و کارێك پێویست کردوە.

## ٢- بەزەیی بەیەکدی داهاتنەوە (التراحم):

لەو بارەشەوە ئایەتی قورئان و دەقی سوننەت زۆرن، بۆ نموونە:

١- خوا سبحانە و تعالی باسی ئەوانە دەکات، کە لەڕۆژی دواییدا دەربازو سەرفراز دەبن، دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ كَانَ مِنَ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾﴾ البلد.

واتە: دوایی لەو کەسانەش بوو کە بڕوایان هێناوەو، یەکدی ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی و، یەکدی ڕادەسپێرن بەبەزەیی بەیەکدی داهاتنەوە.

٢- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: {مَن لا يَرحَم لا يُرحَم} أخرجه أحمد برقم (١٩٢٨٢)، والبخاري برقم (٥٦٦٧)، ومسلم برقم (٢٣١٩)، والطبراني برقم (٢٣٨٨)، وأخرجه أيضا: الترمذي برقم (١٩٢٢) وقال: حسن صحيح.

واتە: هەر کەسێ بەزەیی نەبێ بەرامبەر بە غەیری خۆی، بەزەییشی لەگەڵ نانوێنرێ (لەلایەن خواوە).

٣- هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا دەفەرموێ: {ارْحَمُوا مَنْ فِي الْأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ} أخرجه أبو داود برقم (٤٩٤١)، والبيهقي برقم (١٧٦٨٣)، وأحمد برقم (٦٤٩٤)، والبخاري في التاريخ الكبير (١٩٤/٧)، والترمذي برقم (١٩٢٤) قال: حسن صحيح، والحاكم برقم (٧٢٧٤)، والبيهقي في شعب الإيمان برقم (١١٠٤٨).

واتە: لەگەڵ خەڵکی سەرزەویدا بەزەیی بنوێنن، ئەوەی کە لە ئاسمانە {کە خوای پەروەردگارە} بەزەییتان لەگەڵ دەنوێنێ.

## ٣- هاوکاریی و دەستبار گرتن (التعاون):

خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی (٢)دا دەفەرمووێ:

﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۝٢ ﴾.

واتە: هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاری {چاکەکاریی وەك پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان خۆیان و، پارێزکاریی وەك مامەڵەیان لەگەڵ خوادا}.

## ٤- وەئەستۆ گرتن و لەبن باڵی خۆگرتن (التكافل):

ئەمیش بریتیە لەوەی تەرەفێك تەرەفێکی دیکە بگرێتە خۆی و، لەبن باڵی خۆی بگرێ، سەرپەرشتیی بکات و، ئاگای لێی بێ، (تعاون) ئەوەیە هەردوو تەرەفەکان پێکەوە دەستباری یەکدی بگرن، بەڵام (تكافل) ئەوەیە تەرەفێك تەرەفێکی دیکە بگرێتە خۆی.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەو بارەوە دەفەرمووێ: {أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَلِيلًا} أخرجه أحمد برقم (٢٢٨٧١)، والبخاري برقم (٥٦٥٩)، وأبو داود برقم (٥١٥٠)، والترمذي برقم (١٩١٨) وقال: حسن صحيح.

واتە: من و وە خۆگری منداڵی بێ باب، لە بەهەشتدا، ئاواین، ئاماژەی کرد بە پەنجەی شایەتمانی و پەنجەی گەورەی و، تۆزێك لێکی جیا کردنەوە.

یانی: لەبەهەشتدا ئاوا پلەمان لێك نزیکە.

ئنجا هەندێ کەس وا دەزانێ (یتیم) تەنیا ئەو منداڵەیە کە هی غەیری خۆت بێ، نا، (یتیم) یانی: منداڵی بێ باب، واتە: ژنێکیش کە هاوسەری دەمرێ و منداڵەکانی خۆی بەخێو دەکات، هەر دەیگرێتەوە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خواشدا (صلی الله علیه وسلم) هاتوە، واتە: مەرج نیە منداڵی غەیری خۆت بەخێو بکەی و کەفالەت بکەی، ئنجا ببیە وە خۆگری هەتیو (کافل الیتیم) و ئەو موژدەیە بتگرێتەوە! نەخێر، بەڵکو ئافرەتێکیش کە هاوسەرەکەی دەمرێ و منداڵەکانی بەبێوەژنیی بەخێو دەکات، گومانی تێدا نیە ئەویش دەگرێتەوە.

# باسی حەوتەم

## بواری حەوتەم:
## جەنگ و جیهاد لەپێناوی خوادا

لێرەشدا سێ بەهای بەرز باس دەکەین:

### بەهای یەکەم:

**هـەوڵدان بۆ ئەوەی نـاوی خـوا هەرە بەرز بێ و، تەنیـا ئەوە بە ئامانج بگیرێ لەجەنگ و جیهاد کردندا:**

١- وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ ١٩٣﴾ البقرة.

واتە: لە دژیان بجەنگن، تاکو دەرفەتی ئازاردانی مسوڵمانانیان نامێنێ و، ملکەچیی تەنیا بۆ خوا دەبێ.

٢- پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {مَن قاتَلَ لِتَكونَ كَلِمةَ اللهِ هِيَ العُليا فَهوَ في سَبيلِ الله} أخرجه أحمد برقم (١٩٥١١)، والبخاري برقم

(٧٠٢٠)، ومسلم برقم (١٩٠٤)، وأبو داود (برقم (٢٥١٧) والترمذي برقم (١٦٤٦) وقال: حسن صحيح، والنسائي برقم (٣١٣٦)، وابن ماجه برقم (٢٧٨٣).

واته: هەر كەسێ بۆیە بجەنگێ تاكو ناوی خوا هەرە بەرز بێ، بەس ئەوە لەرێی خوادایە.

پێشتریش گوتمان: (جهاد) وشەیەكی گشتییەو جەنگ (قتال) جۆرێكە لە جۆرەكانی جیهاد، نەك جیهاد بەس لەودا كورت هەڵاتبێ! ئنجا جیهاد دەبێ تەنیا بۆ ئەوە بێ: ناوی خوا بەرز بێ و، هیچ كەس هەیمەنەی بەسەر خەڵكدا نەبێ، ئنجا ئەو كاتە خوا دەپەرستن یان ناپەرستن، كەیفی خۆیانە.

بەهای دووەم:

موجاهیدان بە باشترین خەڵك لەقەڵەم دەدرێن و، شەهید بوون لەپێناوی خوادا، بەرزترین پلەی هەیە:

لەزۆر ئایەتاندا خوای زاناو شارەزا باسی کردوە کە موجاهیدان باشترین خەڵکن و، شەهیدییش لە پێناوی خوادا بەرزترین پلەیە، بۆ وێنە:

١- ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾﴾ النساء.

واتە: بڕوادارانی دانیشتووی بێ گرفتی جەستەیی و تێکۆشەران لەڕێی خوادا بە سامان و گیانیان، یەکسان نین، خوا تێکۆشەران بە سامان و گیانیانی بە پلەیەکی مەزن بەسەر دانیشتواندا هەڵبژاردوە، خوا لێبوردەی میهرەبانە، (تێکۆشەرانی ڕێی خوا) بەچەندان پلەو لێبوردن و بەزەیی لەلایەن خۆیەوە هەڵیبژاردوون و، خوا گفتی پاداشتی هەرەباشی بە هەموو بڕواداران داوە، بەڵام خوا تێکۆشەران بە پاداشتێکی مەزن، بەسەر دانیشتوواندا بەرز کردۆتەوە.

هەڵبەتە ئەم سێ ئایەتە موبارەکە، گەورەترین مەدح و ستایشیان لە بارەی تێکۆشەران و جەنگاوەران لە پێناوی خوادا تێدایە.

خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ النساء.

واتە: هەرکەس فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر بکات، ئەوە لەگەڵ ئەو کەسانەدایە کە خوا چاکەی لەگەڵدا کردوون، لە پێغەمبەران و صیددیقان و شەهیدان و صاڵحان و ئەوانەش باشترین هاوەڵن.

وەك دەبینین: لەدوای پێغەمبەران و ڕاستگۆیان، یەکسەر باسی شەهیدان دەکات، ئنجا باسی صاڵحان دەکات، هەڵبەتە دەشگونجێ هەندێ لە دۆستانی خوا، لە هەندێ شەهیدان پلەیان بەرزتر بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە {شەهیدیی} ئەوە کە ئینسان ڕووحەکەی خۆی لەپێناوی خوادا ببەخشێ، چ پیاو بێ، چ ئافرەت، پلەکەی زۆر زۆر بەرزە، لەو ڕووەوە کە فیداکاریی کردوە، لەپێناوی خوادا.

بەهای سێیەم:

ئازایەتیی و بەخشینی سەرو ماڵ:

ئەمیش لەزۆرێك لە ئایەت و فەرموودەكاندا باس كراوە، كە مسوڵمانان دەبێ ئازا بن، وەك خوای بێوێنە دەفەرموێ:

﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾﴾ الأحزاب.

واتە: لەنێو ئیمانداراندا پیاوانێك هەن {بۆچی باسی پیاوان دەكات؟ لەبەر ئەوەی جیهادو جەنگ زیاتر لەسەر پیاوان فەرزە، ئەگەرنا ئافرەتانیش بیكەن، هەر هەمان پاداشتیان هەیە} ئەو بەڵێنەی لەگەڵ خوادا بەستوویانە، ڕاستیان كردوەو بردوویانەتە سەر، ئنجا هەیانە تەواوی كردوە {شەهید بووە} هەشیانە چاوەڕێ دەكات.

یانی: ئیماندارانی فیداكارو مەرد، دەبێ ئەو دوو حاڵەتەیان هەبێ: یان شەهید بووبن، یان ئامادەبن لەپێناوی دینی خوادا شەهید بن، ئنجا وشەی (رجال) بەمانای ڕاستەقینەی وشە دەیانگرێتەوە.

لێرەشدا كۆتایی بە {بەها بەرزە ئیسلامییەكان} دێنین و، دەچینە سەر پایەی پێنجەم و كۆتایی لە پایەكانی بیركردنەوەیی ئیسلامیی، كە پێوەرەكان (المقاییس)ن:

# بــەرایی

خوێنەری سەنگین!

لەم بەشی پێنجەم و کۆتاییەدا، پێنجەمین پایە لە پایەکانی: {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا} دەتوێژینەوە، ئەویش لە چوار باس (مبحث)دا، هەر باسەی تەرخان دەکەین بە جۆرێك لە چوار جۆرەکانی پێوەرەکان (المقاییس الأربعة)وە، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

١- پێوەری لەیەك جیا کردنەوەی هەق و ناهەق (حق و باطل)، لە بیرو بۆچوونان.

٢- پێوەری لەیەك جیا کردنەوەی پەسند و ناپەسند (معروف ومنكر)، لە قسەو کردەوان.

٣- پێوەری لەیەك جیا کردنەوەی حەڵاڵ و حەڕام، لە شتان.

٤- پێوەری لەیەك جیا کردنەوەی خەڵك و، پۆلێن کردنیان لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ و قەوارەکان.

## باسی یەکەم

## پێوەری لەیەك جیا كردنەوەی هەق و ناهەق (حق و باطل)، لە بیرو بۆچوونان

جۆری یەكەم لە پێوەرەكان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بریتیە لەو تەرازووە، لەو پێوەرە، كە ئینسان هەق و ناهەقی پێ لێك جیادەكاتەوە.

سەرەتاش دەڵێین: وشەی (حق) لە زمانی عەرەبییداو، لە بەكارهێنانی خوای كار بەجێدا، مەبەست پێی شتێكی چەسپاوی نەگۆڕە[1]، لە خودی خۆی و لە واقیعدا، بە پێچەوانەی (باطل)ەوە، كە هەم لە زمانی عەرەبییدا، هەم لە بەكارهێنانی قورئاندا، بریتیە لە شتێك كە: یان ئینسان تێیدا (متوهِّم)ەو بە گومان پێی وایە هەیە، یاخود شتێكە دەگۆڕێ و سەقامگیریی و بەردەوامیی نیە.

ئنجا شایانی باسە: ئاواز (نَغْمَة)ی وشەی (حق) وشەی (باطل)، دەلالەت دەكەن لەسەر مانایەكەشیان:

١- وشەی (حق) لە دوو پیتان پێك هاتوە، (ح) و (ق)، كە هەردووكیان پیتی گەروو (حَلْق)ن، ئنجا ئەگەر سەرنجی ئاواز (نغمة)ی (حق) بدەین كە (ق)ەكە

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٦٢، ط ٢٠١٢م.

دووانن و تێکدا دەغم کراون: (حەقق): هەر جەرەسی وشەکە بۆخۆی دەلالەت لەسەر شتێکی چەسپا و دەکا.

٢- بەڵام وشەی (باطل) هەر جەرەسی وشەکە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکا، کە شتێکی بۆشە، وەك گوتراوە: دەنگی هەیە، بەڵام نێوەڕۆکی نیە[١].

هەڵبەتە کۆمەڵگای مسوڵمان و، مرۆڤی مسوڵمان، تاکە پێوەرو تەرازوویەك کە هەق و باتیڵی پێ لێك جیا دەکاتەوە، لەڕووی بڕواو بیرۆکەکان (معتقدات وأفكار)ەوە، بریتیە لە وەحیی خوا، وەحیی خواش لە کتێبی خوادا، پاشان لە ڕێبازی پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) بەرجەستەیە، زۆرجار من وشەی (ڕێباز) بەکار دێنم و پێم باشترە لە وشەی (سوننەت)، چونکە وشەی (سُنَّة) شەرعزانان (فقهاء) بەجۆرێك پێناسەیان کردوە، (أصوليون) بەجۆرێك پێناسەیان کردوە، زانایانی فەرموودە (مُحدِّثون)یش بە جۆرێکی دیکە:

١)- (سوننەت) لە زاراوەی شەرعزاناندا لە بەرامبەری (واجب)دایە، دەگوترێ: ئەو شتە واجبە، ئەگەر بیکەی، خێرت دەگات و، ئەگەر نەیکەی گوناهباری، بەڵام کە دەگوترێ: ئەو شتە سوننەتە، یانی: ئەگەر بیکەی، خێرت دەگات و، ئەگەر نەیکەی گوناهت ناگا.

٢)- (أصوليون)[٢]یش دەڵێن: سوننەت بریتیە لەو وەحییەی کە جیا لە قورئان بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە و چەند حوکمێکی شەرعیی گرتوونە خۆی.

٣)- زانایانی فەرموودەش دەڵێن: سوننەت بریتیە لە فەرمایشتەکان و کردەوەکان و دان پێدا هێنانەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەو سێ جۆرە پێناسە کراوە.

٤)- بەڵام من پێناسەیەکی دیکەم پێ چاکە، کە ئەوانە هەموویان دەگرێتە خۆی و، شتی زیادەشی دەخاتە گەڵ، ئەویش ئەوەیە کە:

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص١٤٠و ١٤١.

(٢) واتە: زانایاني (أصول الفقه).

{سوننەت بریتیە لە جێ بەجێ کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ قورئان و بەرجەستە کردنی بۆ قورئان، لەسەر ئەرزی واقیع، ئەوەش پێی دەگوترێ: ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (طريقة النبي)} واتە: قورئان بەو شێوەیە دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کردوویەتی و ڕەنگی بۆ ڕشتوە.

بێگومان ئەوەش مانای وانیە: ئێمە غەیری قورئان وەحییەکی دیکەمان نیە، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خوای پەروەردگار هەندێك وەحیی زیادەی بۆ ناردوە، بۆ چۆنیەتی جێبەجێکردنی قورئان، کە ئەگەر ئینسان تەماشای سوننەت بکات، زۆر ئاشکرایە: پرسیارێکی لێکراوە، دەربارەی ئایەتێك، دەربارەی حوکمێکی شەرعیی، دەربارەی مەسەلەیەك، کە نەیزانیوە، جیبریل دابەزیوەو فێری کردوە، ئەویش یەکسەر فەرموویەتی: ئەو پرسیارە، ئەمە وەڵامەکەیەتی، یان ئەو کارە، ئاوا جێبەجێ دەکرێ، بۆ وێنە: پێنج نوێژە فەرزەکان، جیبریل هاتوەو بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێنج نوێژەکانی کردوون: ڕکووع چۆن دەبردرێ؟ سەجدە چۆن دەبردرێ؟ تەحییات چۆنە؟ کاتەکانی نوێژەکان؟ وەك بوخاریی هێناویەتی: جیبریل سەلامی خوای لێبێ، پێنج نوێژە فەرزەکانی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردوون[(١)]، تاکو بە وردیی هەم پێنج کاتەکانیان و، هەم ڕکاتەکانیان و، هەم سەرجەم وردەکارییەکانی نوێژی بە کردەیی پێشان بدات.

کەواتە: بە تەئکید غەیری قورئان وەحیی دیکەش هەیە، کە سوننەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام باشتروایە بگوترێ: ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) (طريقة النبی (صلی الله علیه وسلم))، یاخود جێبەجێکردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ قورئان، کە ئەو جێبەجێ کردنەش، ئەرکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بووە، وەك خوا دەفەرموێ:

---

(١) صحيح البخاري: ٣٢٢١ و، ئەمەش دەقی فەرموودەکەیە: {نَزَلَ جِبْرِيلُ، فَأَمَّنِي فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ}.

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆ خەڵك دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە.

کە بەتەئکید مەبەست پێی ئەوە نەبووە: قورئان تەفسیربکا، ئەگەرنا تەفسیری دەکرد! بەڵکو مەبەست پێی ئەوە بووە، کە قورئان جێبەجێ بکات و، پێشانیان بدا، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی: (وَأَقِيموا الصّلاةَ)، ئنجا ئایا چۆنی بکەین؟ چەند نوێژان بکەین؟ یەکی چەند ڕکاتن؟ چۆنن؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {وَصَلُّوا كما رَأَيْتُمُونِي أصلي} أخرجه أحمد برقم (١٥٦٣٦)، والبخاري برقم (٧٨٥) ومسلم برقم (٦٧٤)، والنسائي برقم (٦٣٥)، وابن حبان برقم (١٦٥٨).

واتە: وەك چۆن بینیتان نوێژم کرد، ئاوا نوێژ بکەن.

حەجێ چۆن بکەین؟ فەرموویەتی: {لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ} أخرجه مسلم برقم (١٢٩٧)، واتە: خوا پەرستییەکان (ی حەج)م لێ وەربگرن، هەروەها شتەکانی دیکە بە هەمان شێوە.

کەواتە: ئێمە بۆ لێك جیاکردنەوەی هەق و باتیڵ، قورئان و، پاشان ڕێبازی پێغەمبەری خاتەممان (صلى الله عليه وسلم) لەبەر دەستدایە، هەقیش تەنیا لەلایەن خوای پەروەردگارەوەیە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡ ﴿٢٩﴾﴾ الكهف: بلێ: هەق تەنیا لە پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا ئایا پەروەردگارمان ئەو هەقەی لە چیدا بەرجەستە کردوە؟ هەڵبەتە لە قورئاندا، وەك خوا عـز وجـل فەرموویەتی:

١)- ﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَ ﴿١٠٥﴾﴾ الإسراء

واتە: بەدڵنیایی قورئانمان بە شێوازێکی هەق دابەزاندوە، هەقیشی گرتۆتە خۆی.

٢)- هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٠﴾﴾ الأحقاف.

واتە: (قورئان) ڕێنمایی (خەڵك) دەکات بەرەو لای هەق و، بەرەو لای ڕێی ڕاست.

**٣)**- هەروەها خوای هەق ئەو هەقە ڕەهایەی لە ڕێباز (سُنَّة)ی پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) بەرجەستە کردوە، چونکە پێی دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسْتَقِيمٖ ﴿٥٢﴾ ﴾ الشورى.

واتە: بە دڵنیایی تۆ (ئەی پێغەمبەر! (صلى الله عليه وسلم)) خەڵك بەرەو حەق ڕێنمایی دەکەی.

ئنجا ئەگەر تەماشای ئەو ئایەتانەی قورئان بکەین، کە باسی هەق و باتیڵ دەکەن، پێنج ڕاستیی مەزنمان دەستگیر دەبن:

**١- خوا سبحانە و تعالى هەر خۆی تەنیا بەدیهێنەرو، پەروەردگارو، خاوەن و، پەرستراوی بە هەقە، ئنجا هەر کەسێك و هەر شتێك، بەشێك لە بەدیهێنەرایەتیی، یان پەروەردگارێتیی، یان خاوەندارێتیی، یان پەرستراوێتیی پاڵ بدرێتە لا، ئەوە دەعوایەکی پووچ و باتیڵە:**

خوای بەرزو مەزن لە چەندان ئایەتدا ئەوەی بەیان کردوە، بۆ وێنە:

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴿٦٢﴾ ﴾ الحج.

دوای ئەوەی چەند ڕاستییەك دەخاتە ڕوو، دەفەرموێ: ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە تەنیا خوا هەقەو، ئەوەی لە جگە لە خوا، لێی دەپاڕێنەوە، پووچ و ناهەقە.

واتە: تەنیا خوا پەرستراوی بە هەقە، چونکە تەنیا ئەو بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگاری هەقە، ئنجا ئێستا ئەوە بۆ ئێمە شتێکی ئاشکرایە، بەڵام تۆ بە وڵاتانی دنیادا بگەڕێ، ئنجا قەدری ڕوونکردنەوەی ئەو هەقەت لە قورئاندا بۆ دەردەکەوێ:

بۆ وێنە:

١)- لە هیندستان: مانگا دەپەرستن، مارو مشك دەپەرستن.

٢)- لە کۆتایی ساڵی (٢٠١٠ز)دا بە شاندێك بۆ بەشدارییکردن لە کۆنگرەی پەرلەمانتارەکانی وڵاتانی کیشوەری ئاسیادا، چووین بۆ مالیزیاو، بۆ کەمبۆدیا، دیتم مار دەپەرستن، مشك دەپەرستن، هەروەها جرو جانەوەری دیکە دەپەرستن، پەیکەریان بۆ دروست کردوون و پەرستگایان هەیە.

٣)- هەروەها زۆر لە مەسیحییەکان عیسا سەلامی خوای لێبێ، دەپەرستن، تەماشای (پەیمانی نوێ)ی (کتێبی پیرۆز) (الکتاب المقدس) بکەن! عیسا بە خوا دادەنێن.[1]

٤)- هەروەها جوولەکەکانیش، هەر چەندە جوولەکە لەو بارەوە سەلامەتترن و لە تەوحیدەوە نزیکترن.

٥)- هەروەها حیزب و ڕژێمە عەلمانییەکان ئایا چی دەپەرستن؟ ئەو کەسانە دەپەرستن کە حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دادەنێن، چاکە و خراپەیان بۆ دادەنێن، ئەوانیش پێیانەوە پابەند دەبن و، ئا ئەوەش پەرستنە.

**٢- خوا سبحانە و تعالی هەقی لە خۆیدا کورتهەڵێناوەو، ڕایانگەیاندوە کە: ڕێنمایی بۆ هەق تەنیا بەدەست خوایە، چ لەو ڕووەوە کە هەر خوا هەقی دابەزاندوە، چ لەو ڕووەوە کە هەر خوای کاربەجێ ڕێنمایی خەڵك دەکا بۆ گرتنی ڕێی هەق:**

وەك دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف.

واتە: بڵێ: هەق تەنیا لەلایەن پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا کێ حەز دەکات با بڕوا بێنێ و، کێش حەز دەکات با بێ بڕوا بێ...

هەروەها لە سووڕەتی (یونس)دا خوای بێهاوتا دەفەرموێ:

---

(١) لە: (الکتاب الخامس) {موسوعة: الإسلام کما یتجلی في کتاب الله}دا، بەدرێژیی باسی ئەو مەسەلەیەمان کردوە، هەروەها لە {مەوسووعەی: ئیمان و ئیلحاد..}دا.

﴿ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ﴿٣٥﴾ ﴾ یونس.

واتە: بڵێ: ئایا هیچ کام لە هاوبەشەکانتان (خەڵك) بەرەو هەق ڕێنمایی دەکات؟ بڵێ: بەس خوا خەڵك ڕێنمایی دەکا، بۆ هەق.

**٣- هەمیشە ئەهلی باتیڵ بە سەرۆکایەتیی تاغووتەکان، هەقێك کە پێغەمبەران هێناویانە لە خواوە، ڕەفزیان کردوەو، لە بەرامبەر هەقدا پەنایان بردۆتە بەر هەڕەشە و گوڕەشەو، موجادەلە و مشت و مڕی بەتاڵ:**

وەك خوای تاك و پاك لە سەرەتای سوورەتی (غافر)دا دەفەرمویٚ: ﴿ مَا يُجَٰدِلُ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِى ٱلْبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۖ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ۖ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ ۖ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ ﴾ غافر.

واتە: جگە لە بێبڕوایان هیچکەس مشت و مڕ لە دژی ئایەتەکانی خوا ناکات، با هاتن و چوون و گەڕان و سووڕانیان لە وڵاتاندا فریوت نەدات، پێش ئەمان گەلی نووح و کافرانی دوای وانیش پێغەمبەرانیان بەدرۆ داناو، هەر کۆمەڵێك (ی کافر) نیازی گرتنی پێغەمبەرەکەیانیان هەبوو و، بەناهەقیش شەڕو قسەیان کرد تاکو - بەخەیاڵی خۆیان - هەقی پێ پووچەڵ بکەنەوە، سەرەنجام منیش گرتمن (ئنجا بزانە) سزادانەکەم چۆن بوو!

**٤- سەرەنجامی کۆتایی تێك گیرانی هەق و باتیڵ، ئەوەیە کە لە ئاکامدا باتیڵ لەبەین دەچێ و، هەق سەردەکەوێ، بە مەرجێك ئەهلی هەق یاساکانی خوا ڕەچاو بکەن، لە ئامادە کردنی هێزو، مەرجەکانی سەرکەوتن، ئەگەر نا هەق هەر لە خۆڕا سەرناکەوێ:**

وەك خوای هەق فەرموویەتی: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: بڵێ: هەق هات و باتیڵ فەوتا (پووچەڵ بۆوە) بێگومان باتیڵ فەوتاوو پووچەڵە.

بەڵام لێرەدا دەبێ وریا بین! هەتا هەق نەیەتە مەیدانێ، پووچەڵیی (باطل) دەرناکەوێ، ﴿وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ﴾ بۆیەش لە هەندێك کتێبی خۆمدا گوتوومە:

{هەقێکی پشتگوێ خراو، دەکەوێتە ژێر باتیڵێکی خزمەتکراو و پشتگیریی لێکراو}، بێگومان ئیسلام هەقە، بەڵام ئایا بۆچی ئێستا ئەهلی ئیسلام ژێر دەستن؟ چونکە ئەهلی ئیسلام وەك پێویست خەمیان لە ئیسلامی خۆیان نەخواردوەو، پێیوەی پابەند نەبوون:

أ- نە وەك لێ تێگەیشتن.

ب- نە وەك پێوە پابەند بوون.

ج- نەوەك بەرگریی لێکردن.

کەواتە: دەبێ ئەهلی هەق مەرجەکانی سەرکەوتن لە خۆیاندا بێننە دی، ئنجا ئەو هەقەی کە پێیانە، بەرجەستە دەبێ لە دنیای واقیع دا، هەق هەر خۆی هەقە، چ سەربکەوێ و دەسەڵاتی هەبێ، یان نا، بەڵام لە دنیای واقیع دا، کاتێك بەرجەستە دەبێ، کە مەرجەکانی سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر بکرێن.

**٥- لە دوا ڕۆژدا، دوای ئەوەی ئەهلی بەهەشت لە بەهەشتدا نیشتەجێ دەبن و، ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخدا نیشتەجێ دەبن، بۆ هەر کامێکیان ڕاستیی بەڵێنی خوای بۆ دەردەکەوێ و، کە ئەهلی باتیڵ تێدەگەن و دەگەنە دڵنیایی کە لەسەر بەتاڵ بوون و، ئەهلی هەقیش هەقی خۆیانیان بۆ دەردەکەوێ:**

وەك خوا عز وجل لە سوورەتی (الأعراف)دا فەرموویەتی: ﴿وَنَادَىٰٓ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَـٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُوا۟ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌۢ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾﴾.

واتە: هاوەڵانی بەهەشت (یان خاوەنانی بەهەشت) بانگی هاوەڵانی (یان خاوەنانی ) دۆزەخ دەکەن: ئەوەی کە پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابووین، دیتمان ڕاستە، ئایا ئێوەش ئەوەی پەروەردگارتان بەڵێنی پێدابوون {کە دەچنە دۆزەخ ئەگەر لەسەر ڕێی چەوت بڕۆن} دیتتان؟ گوتیان: بەڵێ، ئنجا جاڕچییەك جاڕیدا، نەفرینی خوا لە ستەمکاران.

ئەوە بە نسبەت پێوەرو تەرازووی یەکەمەوە، بۆ هەڵسەنگاندن و، لێك جیاکردنەوەی هەق و ناهەق.



باسی
دووەم

## پێوەری لێك جیا کردنەوەی پەسند (معروف) و
## ناپەسند (منکر)، لە قسەو کردەوان

بۆ لێك جیاکردنەوەی پەسند و ناپەسند، چاك و خراپ (معروف و منکر) لە بواری قسەو کردەوان دا، سەرەتا پێویستە: چەمك و واتای (معروف) و (منکر) بزانین:

١)- (معروف): پسپۆڕو شارەزایانی زمان گوتوویانە: {المعروف: هو کل ما تعرفه الفطر والعقول السلیمة، وتراه نافعاً وصالحاً}[١] کە ئەوە پێناسەیەکی کورت و پوختە، واتە: (معروف): هەر شتێکە کە: سروشتە ساغەکان و عەقڵە سەلیمەکان، بە سوود بەخش و چاکی بزانن.

ئنجا هەر شتێك، سروشتی ساغی مرۆڤ و، عەقڵی تەواوی مرۆڤ، بە چاکی بزانێ و، پەسەندی بکا، بە تەئکید شەریعەتیش پەسندی دەکا.

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص ٥٦١، (والمعروف: إسم لکلِّ فعلٍ یُعرف بالعَقل أو الشرع حُسنُهُ).

٢)- (المنكر): (منكر)یش کە پێچەوانەکەی (معروف)ە، بریتیە لە هەر شتێك کە سروشتی ساغی مرۆڤ و، عەقڵی ساغی مرۆڤ بە خراپ و زیانبەخشی بزانێ[1].

واتە: خوای کاربەجێ پێناسەی پەسندو ناپەسندی حەواڵە کردوە بۆ عەقڵی خەڵك و عورفی خەڵك، خوای پەروەردگار کاتێك دەفەرموێ: (بالمعروف) بەشێوەیەکی بە پەسند زانراو، دیاریی نەکردوە چۆن و، حەواڵەی عورف و باوی خەڵکی کردۆتەوە، واتە: ئەوەی خەڵك بە عەقڵی خۆیان بە چاکی دەزانن، لەو سنوورە گشتییانەدا کە شەریعەت دایناون - کە دیارە ئەمەش متمانە هەبوونی شەریعەت بە عەقڵ و فیترەتی مرۆڤ دەگەیەنێ-.

ئنجا پەسند و ناپەسند، هەر چەندە عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغ، تاکو ڕاددەیەکی زۆر لێکیان جیادەکاتەوە، بەڵام قسەی کۆتایی -وەك دوایی لە تەوەری پێنجەمدا لە باسی پەیوەندیی نێوان عەقڵ و نەقڵدا، دەیگەینێ- قسەی کۆتایی لە دیارییکردنی پەسندەکان و ناپەسندەکاندا، عایدی وەحییە، چونکە عەقڵی مرۆڤ، هەر چۆن بێ، دروستکراوێکی خوای زاناو توانایەو، ئەسڵەن لەگەڵ وەحیی خوادا ناچێتە تەرازووەوەو، لە چاو وی شتێکی بچووکە، بەڵام خوا توانای داوەتێ کە تاکو ڕاددەیەکی زۆر، چاك و خراپ و پەسند و ناپەسندو حەڵاڵ و حەرام لێك جیا بکاتەوە، بەڵام ئایا بەتەواویی دەتوانێ ئەوە بکات؟ بێگومان نەخێر، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەوە: ئەو هەموو فەیلەسووف و بیرمەندانەی ئێستاو ئەوانەش کە لە مێژوودا بوون، تووشی هەڵەی سەیرو سەمەرە بوون! ئێستا وڵاتانی ڕۆژئاوایی تەماشا بکەن! بەڵێ لە ڕووی ژیان و گوزەرانی ماددیی و لەڕووی کۆمەڵایەتیی و، لە ڕووی حوکم و سیاسەتەوە، بە هەندێك ئەزموونی باش گەیشتوون و، ژیانی خۆیان پێشخستوە، بەڵام بێگومان شتی زۆر خراپ، بگرە قێزەوەن و بێ ماناشیان هەیە، بەتایبەت لە بواری عەقیدەو پەیوەندیی لەگەڵ خواداو، لە بواری باری کەسێتیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتییدا، چونکە: فیترەتی مرۆڤ نەخۆش دەبێ

---

(١) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ص٨٢٣.

و لادەدات و، عەقڵی مرۆڤ دەکەوێتە ژێر کاریگەریی عاتیفەو ئارەزووی، تەنانەت هی پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێبێ، بۆ وێنە: پێغەرمبەرێکی پایە بەرزی وەك داوود عاتیفە بەسەریدا زاڵ بووە، -وەك پێشتر باسمان کرد- هەروەها پێغەمبەرێکی زۆر پایە بەرزی وەك موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ئەگەر شەیتان شتێکی لە بیر بردیەوە، دوایی کە بە بیرت هاتەوە، لەوێ دامەنیشە:

﴿ وَإِذَا رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦ ۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيْطَٰنُ فَلَا تَقْعُدْ بَعْدَ ٱلذِّكْرَىٰ مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: هەر کات ئەوانەت بینی کە بە خراپیی باسی ئایەتەکانی ئێمە دەکەن، پشتیان تێ بکە، تاکو دەچنە نێو باسێکی دیکەوەو، هەر کاتیش شەیتان لەبیری بردیەوە، پاش بیرکەوتنەوە لەگەڵ کۆمەڵی ستەمکاراندا دامەنیشە.

هەروەها پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەك لە صەحیحی موسلیم دا هاتوە[1]، فەرموویەتی: کە لە یەکێکتان تووڕە بووم و دوعایەکی خراپم لێکرد، من پێشتر لە خوا پاڕاومەوەو مەرجم لەگەڵدا گرتوە کە هەر کەسێك دوعای خراپم لێکرد، خوا بۆی بە پاکبوونەوەو چاکە بگێڕێ، مادام شایستەی سزادران نەبێ.

کەواتە: پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) تووڕە بووە، ئەویش هەر بەشەر بووە، هەروەها جاری وا بووە لە بۆچوونێکی دنیاییدا نەپێکاوە.

کەواتە: عەقڵ بەهەڵەدا دەچێ ئەگەر عەقڵی پێغەمبەرانیش بێ سەلامی خوایان لێبێ، کە بێگومان، برا و خوشکانی بەڕێز! عەقڵی پێغەمبەران تەواوترین

---

(١) کە ئەمە دەقەکەیەتی: {يَا أُمَّ سُلَيْمٍ! أَمَا تَعْلَمِينَ أَنَّ شَرْطِي عَلَى رَبِّي أَنِّي اشْتَرَطْتُ عَلَى رَبِّي فَقُلْتُ: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ أَرْضَى كَمَا يَرْضَى الْبَشَرُ، وَأَغْضَبُ كَمَا يَغْضَبُ الْبَشَرُ، فَأَيُّمَا أَحَدٍ دَعَوْتُ عَلَيْهِ مِنْ أُمَّتِي بِدَعْوَةٍ لَيْسَ لَهَا بِأَهْلٍ، أَنْ يَجْعَلَهَا لَهُ طَهُورًا وَزَكَاةً} أخرجه مسلم (٢٠٠٩/٤ ، رقم ٢٦٠٣) ، وابن حبان (٤٤٤/١٤ ، رقم ٦٥١٤).

و چاکترین عەقڵە بووەو، پێغەمبەران لە لووتکەی عاقڵمەندیی و ژیریی و تێگەیشتن دابوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، هەتا وەحیی خوایان بۆ نەهاتوە، هەندێك شتیان نەزانیوە، ئەوەتا خوا بە پێغەمبەری خاتەمی فەرمووە:

﴿مَا كُنتَ تَدۡرِي مَا ٱلۡكِتَٰبُ وَلَا ٱلۡإِيمَٰنُ ﴿٥٢﴾﴾ الشورى.

واتە: پێشتر نەتدەزانی بەرنامە چییەو ئیمان چییە!

ئنجا با تەماشای هەندێك لە پەسندو ناپەسندەکان بکەین، کە لە هەشت بواردا، یەکی نموونەیەکم لێ هێناونەوەو، بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕۆشنتر بێ: پەسند (معروف) چییەو، ناپەسند (خراپ) چییە؟!

## ا- لە بواری ئیمان و عەقیدەدا:

أ- لەم بوارەدا خوا فەرمانی پێکردووین بە خوا بەیەکگرتن (توحید)، کە وەك پێشتریش باسمان کرد: ئەوە گەورەترین پەسندە لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، خوا دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: ئا ئەوەتان پەروەردگارتانە (پێشتر باسی سیفەتەکانی دەکا)، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بەدیهێنەری هەموو شتێکە، هەر ئەو بپەرستن و، بەندایەتیی تەنیا بۆ وی بکەن و، ئەو چاودێرو سەرپەرشتیاری هەموو شتێکە.

ب- هەروەها گەورەترین ناپەسند (منكر) لەبواری ئیمان و عەقیدەدا، بریتیە لە شیرك، کە وەك پێشتریش باسمان کردوە، باشترین پێناسە بۆ (شرك)، ئەو ڕستە قورئانییەیە، کە لە سوورەتی (الشعراء)دا هاتوە، دیارە زانایان زۆر قسەیان کردوە لەبارەی شیرکەوەو، من لە {تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز}دا، لە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (یوسف)دا، باسێکی خەست و خۆڵم کردوە دەربارەی شیرك، بەڵام باشترین پێناسە بۆ شیرك ئەو ڕستە قورئانییەیە، کە خوا دەفەرموێ، کافرەکان لە دۆزەخدا دەڵێن:

﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾

واتە: سوێند بەخوا ئێمە لە گومڕاییەکی ڕووندا بووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییەکاندا.

بەڵێ شیرك: بریتیە لە یەکسان کردنی غەیری خوا لەگەڵ خوادا:

١)- چ لە بەدیهێنەرایەتییدا، وەك مەجووسییەکان: ئەهریمەن و یەزدان، خوای خێر و شەڕیان داناوە، هەروەها وەك یەزیدییەکان، کە پێیان وایە {طاوس مەلەك} چی وای لە خوا کەمتر نیە!

٢)- چ لە بواری پەروەردگارێتییدا.

٣)- چ لە بواری خاوەندارێتییدا.

٤)- چ لە بواری ناو و سیفەتەکاندا.

٥)- چ لە بواری پەرستن و بەندایەتیی بۆ کردندا.

٦)- چ لە بواری پشت پێ بەستن و لێ پاڕانەوەو داوا لێکردندا، واتە: داوا کردنی ئەو شتانەی کە تەنیا بەخوا دەکرێن، لە جگە لە خوا، وەك شیفادان و، سەرخستن و، ژێرخستن و، نەخۆش کردن و، ساغ کردن، کە لەم ڕۆژگارەدا لەو بارەوە لە نێو مسوڵمانانندا لادانی زۆر هەیە، لە بواری بڕوا بووندا بەوە کە غەیری خوا وەك خوای لە دەست دێ!

بۆ وێنە: هەندێك لە ئەهلی تەصەووف لێیان بیستراوە گوتوویانە: هیچ دڵۆپە بارانێك لە ئاسمانێ نایەتە خوارێ و، هیچ پنچە گیایەك ناڕوێ بەبێ ئیزنی شێخ!! کە نازانم ئەو قسەیەی لە کاتی تووڕە بووندا بووەو عەقڵی لەسەر خۆی نەبووە، یان نا؟ ئایا پێش ئەوەی شێخ ببێ، باران چۆن باریوەو گیا چۆن ڕواوە؟ هەروەها دوای شێخ دنیا چی لێ دێ؟

یان جاری وابووە ئەگەر کەسێك قسەیەکی گوتبێ و دوایی نەخۆش کەوتبێ، گوتوویانە: ئەوە شێخ نەخۆشی خست، یان ئەگەر نەخۆشێك چاك بووبێ، پێیان وابووە: شێخ ساغی کردوە! بەڵام ئیبراهیم سەلامی خوای لێبێ کە (خلیل الله) یە، دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: هەر کات نەخۆش کەوتم، هەر خوا شیفام دەدا.

وەك دەبینین بەشێوەی کورتهەڵێنان (حصر) هێناویەتی، یانی: بەس خوا شیفا دەدە، ئەگەر یەکێك بڵێ: ئەدی دکتۆر و دەرمان؟ دەڵێین: ئەوانە هۆکارن، بەڵام شیفادەر (شافي) تەنیا خوایە، بەڵام ئەو هۆکارانەشی ڕەخساندوون و، ئەگەر هۆکارەکانیش بگرینە بەر، ئەو هۆکارانەش هەر خوا دروستیکردوون و، ئەو عەقڵەش کە خوا داویەتی بە پزیشکەکان، هەر خوا پێی داون، شتەکە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ خوای پەروەردگار، بەڵام جاری وا هەیە، ئەگەر خوا ئیزنی لەسەر نەبێ، هۆکارەکانیش هەن، بەڵام ئەو دەرەنجامەیان نابێ و، جاری واش هەیە، بەبێ هۆکاریش خوای باڵادەست ئەگەر شتێکی بوێ دەیکا، بۆ وێنە: خەڵك هەبووە نەخۆشیی شێرپەنجەی هەبووە، دوعای بۆ کراوە چاك بووە! هەروەها خەڵك هەبووە بەردی لە گورچیلەدا بووە، پێشێ پشکنینیان بۆی کردوە، گورچیلەی بەردی تێدا بووە، دوایی کەسێك دوعای بۆ کردوە، بەردەکە نەماوە! هەروەها کەسی وا بووە نەخۆشیی فەقەراتی هەبووە، کوڕ کوڕ بۆتەوە، دوعای بۆ کراوە، چاك بووەتەوە! بەڵام بە زۆریی بنچینە وایە: {خوا هیچ دەردێکی نەناردوە، مەگەر دەرمانێکی لەگەڵ دابەزاندوە}[1]، بنچینەی گشتی وایە، بەڵام کە بنچینەی گشتی وایە، مانای وانیە خوای باڵادەست ناتوانێ لە بازنەی یاساکانی خۆی دەربچێ، نا، خوای بەرزو مەزن بۆ خۆی یاساکانی داناون، سەرنج بدەن! بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، ئەو هەموو قانوون شکێنییەی کردوە:

١- ئایا هەرگیز گۆچان بووە بە مارێکی گەورە، دنیا لە زاقە زاق بنێ، وەك گۆچانەی مووسا سەلامی خوای لێبێ؟ وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الأعراف.

---

(١) ئەوە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم): {فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يُنَزِّلْ دَاءً إِلَّا أَنْزَلَ مَعَهُ شِفَاءً} أخرجه أحمد برقم: (١٨٤٧٨) قال: شعيب الأرناؤوط: حديث صحيح، وهذا إسناد حسن من أجل المطلب بن زياد، وبقية رجاله ثقات رجال الشيخين.

٢- عیسا سەلامی خوای لێبێ مردووی زیندوو کردۆتەوەو، هەموو جۆرە نەخۆشییەکی چاك کردۆتەوە، وەك خوا عز وجل فەرموویەتی:

﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ ﴾ المائدة.

٣- ئنجا پێغەمبەر (محمد) (صلی الله علیه وسلم) لە کاتێکدا کە لە ڕووداوی (حدیبیە)و لە چەند شوێنێکی دیکەدا بێ ئاو بوون و، زۆر نارەحەت بوون، لە نێو پەنجەکانی ئاو هەڵقوڵیوەو، هەرچی کوندە و مەشکە و مەنجەڵ بووە پڕیان کردوە!! وەك لە (صحیح البخاري: ٣٥٧٩) و (صحیح مسلم: ٢٢٧٩)دا هاتوە.

خوای پەروەردگار زۆر جاران قانوون شکێنیی کردوە بۆ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ، کە ئەو حاڵەتانەش پێیان دەگوترێ: موعجیزەو، بۆ غەیری پێغەمبەران، پێیان دەگوترێ: کەرامەت و، هەموویشی یاسادڕ (خارق العادة) یە، مەبەست ئەوەیە: نابێ هیچ شتێك بهێندرێتە ڕیزی خوا، ئەگەر نا، شیرکە، ئنجا لە پەرستراوێتییدا بێ، لە ناو و سیفەتەکانیدا بێ، لە کردەوەکانیدا بێ، لە بەدیهێنەرایەتییدا بێ، لە هەر شتێکی دابێ.

٢)- لە بواری دروشمەکانی خوا پەرستییدا:

أ- گەورەترین پەسند (معروف) لەم بوارەدا بریتیە: لە بەگەورە گرتنی دروشمەکان، وەك خوای زاناو کارزان دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾ الحج.

واتە: هەر کەس دروشمەکانی خوا بەمەزن بگرێ، ئەوە لە پارێزکاریی دڵانە.

بەڵێ گەورەترین پەسند، لەبواری خوا پەرستییدا، لەبواری دروشمەکانی پەرستندا ئەوەیە کە: دروشمەکانی خوا بە بەرزو گەورە بگیرێن، مسوڵمانان کە حەج دەکەن، نوێژی بەکۆمەڵ دەکەن، جومعە دەکەن، زیکری خوا دەکەن، قوربانیی بۆ خوا سەر دەبڕن، ئەوانە هەموویان دروشمی خوان و، دەبێ بە گەورە بگیرێن و، ئەوەش لەبواری دروشمەکانی پەرستندا گەورەترین پەسندە.

ب- گەورەترین ناپەسند (منکر)یش ئەوەیە کە ئەو پەرستشانە، ئەو دروشمانە، ئەنجام بدرێن، بەڵام بەشێوەیەکی بێ نێوەڕۆك، وەك خوا سبحانە و تعالی دەفەرموێ:

﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الماعون.

واتە: سزای سەخت بۆ ئەو نوێژکەرانەی، کە لە نوێژەکانیان بێئاگان، واتە: نوێژ دەکەن بەڵام لێی بێئاگان، ئاگایان لێی نیە، لێی نافامن و، فکری لێ ناکەنەوەو، کارلێکی لەگەڵدا ناکەن.

هەروەها خوای کاربەجێ بە ئیماندارانی فەرمووە:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بەسەرخۆشیی توخنی نوێژ مەکەون، تاکو دەزانن چی دەڵێن.

ئنجا زانایان لەوەوە قیاسیان کردوە، کە: هەر حاڵەتێکی دیکەی وات هەبوو کەنەزانی چی دەڵێی، بۆ وێنە: سەغڵەت بووی، یان تووڕە بووی، یان زۆر برسیی بووی، یان زۆر تینوو بووی، وا باشە حاڵەتی سەغڵەتیی و تووڕەییەکەت نەمێنێ، نانەکەت بخۆی و، ئاوەکەت بخۆیەوە، ئنجا نوێژەکەت بکەی، بۆ ئەوەی کە بزانی چی دەڵێی!

### ٣- لە بورایی حوکم و سیاسەتدا:

أ- لەو بوارەشدا گەورەترین پەسند بریتیە لە: بەڕێوە بردنی کۆمەڵگا بەڕاوێژ (شوری) خوا عز وجل فەرموویەتی:

﴿ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ٣٨ ﴾ الشوری.

بە حەقیقەت شووڕا گەورەترین خەسڵەتی پەسندە، لە بواری حوکم و سیاسەتدا، بۆ ئیدارەدانی کۆمەڵگا.

ب- گەورەترین ناپەسند (منکر)یش، بریتیە: لە خۆسەپاندن و، حیساب نەکردن بۆ خەڵك و پێشێل کردنی ئیرادە و ویستی خەڵك، بۆیە خوا سبحانە و تعالی ئەوەندە باسی بەسەرهاتی مووسا سەلامی خوای لێبێ و فیرعەون دەکاو، ئەوەندە زەمی فیرعەون دەکاو ڕەخنەی لێ دەگرێ بۆ وێنە:

﴿ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٤ ﴾ القصص.

واتە: بە دڵنیایی فیرعەون لەسەر زەمیندا (بەناهەق) خۆی بەرز کردەوەو خەڵکەکەی بەش بەشکرد، بەشێکیانی دەچەوساندەوە: کوڕەکانیانی سەردەبڕن و ئافرەتەکانیانی بە زیندوویی دەهێشتنەوە، مسۆگەر ئەو لە تێکدەران بوو.

هەڵبەتە خوای کاربەجێ کە لەچەندان ئایەتدا، زەمی فیرعەون دەکا، لەبەر خۆ سەپاندن (إستبداد)ی بووە، کە یەکێك لە قسەکانی فیرعەون ئەوە بووە گوتوویەتی:

﴿ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩ ﴾ غافر.

واتە: هەر ئەوەتان پێ دەڵێم: کە بۆخۆم بە چاکی دەزانم و، ئەوەی منیش دەیڵێم هەمووی ڕاستە.

ئا ئەوەش خۆسەپاندن و حیساب نەکردنە بۆ خەڵك، کە تۆ پێت وابێ، هەق لە تۆدا کورتهەڵاتوە، پێت وابێ کەسی دیکە مافی قسە کردنی نیە!! ئنجا فیرعەون بە زمانی وتار (مقال) گوتوویەتی و خەڵکی دیکە بەزمانی کردار (حال) دەیڵێ!

کەچی لە هەمان کاتدا، خوا ستایشی ئافرەتێك دەکا، کە {شاژنی سەبەء - ملکة سبأ }ە، بۆچی؟ چونکە ئەو سیاسەتەکەی پێچەوانەی فیرعەون بوو، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ قَالَتْ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ إِنِّي أُلْقِيَ إِلَيَّ كِتَابٌ كَرِيمٌ (٢٩) إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ (٣٠) أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ (٣١) ﴾ النمل.

واتە: گوتی: ئەی مەجلیس! ئەی قسە بەدەستان! من نامەیەکی بەڕێزم بۆ هاتوە، کە لە سولەیمانەوەیەو، نێوەڕۆکەکەی ئاوایە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، خۆتان لە بەرامبەر مندا بەبەرز مەگرن و بە ملکەچیی بۆ لای من وەرن.

کە لێرەدا (وأتوني مسلمين) مەبەست مسوڵمان بوون نیە، چونکە جارێ نازانن مسوڵمانەتیی چیە، چۆن مسوڵمان دەبن؟ هەرچەندە هەندێك لە تەفسیرەکان وایان نووسیوە! چونکە شاژنەکە لە کۆتایی ئایەتەکاندا دەڵێ:

﴿ وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٤٤) ﴾ النمل.

واتە: لەگەڵ سولەیماندا بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان ملکەچ بووم.

لەوێ مسوڵمان دەبێ، دوای ئەوەی کە موعجیزەکانی سولەیمان دەبینێ و بەبەڵگە مسوڵمان دەبێ، چونکە ئیسلام تۆبزیی کردن بەکار ناهێنێ، بڵێ: سەرەتا دەبێ مسوڵمان بن، ئنجا بێن!

﴿ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ (٣١) ﴾ النمل.

واتە: بەملکەچیی وەرن و لە بەرامبەر مندا خۆتان بەبەرز مەگرن، من بانگەوازتان دەکەم، وەرن تێبگەن، وەرن دیالۆگ بکەین.

ئنجا ئایا ئەو ئافرەتە دەڵێ چی؟

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾﴾ النمل.

ئەی بڕیار بەدەستینە! لەکاروباری خۆمدا فەتوام بۆ بدەن، ڕاوێژم بۆ بکەن، ڕای خۆتانم پێ بڵێن.

﴿مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾﴾ النمل.

من عادەتم وایە هیچ بڕیارێك نادەم، هیچ کارێك یەکلایی ناکەمەوە، تاکو ئێوەش لێرە نەبن و، ئێوەش ڕای خۆتان نەڵێن.

کە ئەمەش نێوەڕۆکی شووڕایە، مەبەستم ئەوەیە کە لە بواری حوکم و سیاسەتدا، گەورەترین پەسند (معروف) بریتیە: لەکاروبار بەڕێوەبردن بە ڕاوێژو، گەورەترین ناپەسند( فکر)یش، بریتیە: لە خۆسەپاندن (إستبداد) و حیساب نەکردن بۆ خەڵك.

٤- لە بواری ئابووریی و دارییدا:

أ- گەورەترین پەسند (معروف) لەم بوارەدا بەبۆچوونی من بریتیە لە: ماڵ بەخشین و، هاوکاریی کردنی خەڵك و، دەستگرۆیی خەڵك و، بەکارهێنانی ئەو ماڵە، لە ڕەزامەندیی خواو بەرژەوەندیی خەڵکدا، خوا عز وجل فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰكُم ﴿٢٥٤﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەوەی پێمان داون، ببەخشن.

ب- گەورەترین ناپەسند (منكر)یش بریتیە لە: سوود خۆریی (ڕِبـــا)، لەم ڕۆژگارەشماندا سوود خۆریی (ربا) گەورەترین هەڕەشەیە، لەسەر ئابووریی دنیا، بەهۆی زیاتر تێکدانی هاوسەنگییەوە لە نێوان دەوڵەمەندان و هەژاراندا، چونکە ڕیبا دەبێتە هۆی ئەوەی ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی دەوڵەمەندەکان کەمتر بێ و، پارەیان زیاتر بێ و، ژمارەی هەژارەکانیش زیاتر بێ و، دەرامەتیان کەمتر بێ، لە دنیای ئێستادا: (٥٪)ی خەڵك خاوەنی (٩٥٪)ی سامان و دارایی دنیایەو، (٩٥٪)ی خەڵك، خاوەنی (٥٪)ی داراییە! ئەوەش جیاوازییەکی زۆر زۆرە، هەڵبەتە ئەویش ئەوەی پێی دەگوترێ: وڵاتانی باکوور (شمال) واتە: ڕۆژئاواو ئەمریکاو ئەوانە، دەوڵەمەندییەکە بەزۆریی لەوێیە، ئەوانەش کە پێیان دەگوترێ: وڵاتانی خواروو (جنوب)، هەژارییەکەش زۆربەی لەوێیە.

خواش ڕێگریی لە ڕیبا کردوە، وەك چۆن فەرمانی بە بەخشین کردوە وەك فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر ئیماندارن، واز لە سوود خۆریی بێنن.

هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾ الروم.

واتە: مافی خزم و نەدارو ڕێبوار بدە، ئەوە چاکترە بۆ ئەوانەی ڕووی (ڕەزامەندیی) خوایان دەوێ و، هەر ئەوانەش سەرفرازن، ئەو مامەڵە سوود خۆرییەش کە دەیکەن، تاکو لە سامانی خەڵکیدا زیاد بکات (سوود وەربگرن) لەلای خوا زیاد ناکات، بەڵام ئەو زەکاتەی بەمەبەستی (دیداری) ڕووی (ڕەزامەندیی) خوا، دەیدەن، ئا ئەوانە پاداشتیان بۆ چەند بەرانبەر دەکرێ.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە حەجی ماڵ ئاواییدا فەرمووی: ڕیبای سەردەمی نەفامیی لەژێر ئەو دوو پێیانەم دایە، پێش هەمووان ڕیبای عەبباسی مامم[1]! کەچی ئێستا وڵاتانی ئیسلامیی تەماشا بکە! کە بەداخەوە، هەمووشی خۆی بەمسوڵمان دەزانێ و، مامەڵەش بەڕیباوە دەکەن!



---

(١) صحيح مسلم: ٢٩٤١، وسنن أبي داود: ١٩٠٩، وسنن الدارقطني: ٣٠٧٤، هەروەها بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية، محمد حميدالله، ص٣٦٠-٣٦٢، کە ئەمە دەقی ئەو فەرمایشتەیەتی لەو بارەوە: {... وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُ رِبَانَا: رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ}.

## ٥- لە بواری کۆمەڵایەتییدا:

أ- گەورەترین پەسندیش لەو بوارەدا: دادگەریی و چاکەکاریی و بەخشینە بە نیزیکان، بۆیەش خوا عز وجل فەرمانی کردوە بە دادگەریی و، بەچاکەکاریی و، بەبەخشین بەنزیکان.

ب- خراپترین ناپەسندیش بریتیە: لە قسەو کرداری ناقۆڵا (فحشاء) و، کردارو قسەی دزێو (منكر) و، دەستدرێژیی (بَغي)، بۆیەش خوا نەهی لێ کردوون، وەك دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآىِٕ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٩٠﴾﴾ النحل.

واتە: بێگومان خوا فەرمان دەكا بە: دادگەریی و، چاکەکاریی و بەبەخشین بە نزیکان {نزیکان: خزم بێ، دۆست بێ، کەسێك بێ کە دراوسێتە، هەموویان دەگرێتەوە هەر چەندە هەندێ لەگەڵ ئەوەن کە تەنیا خزمان دەگرێتەوە} هەروەها خوا ڕێگریی دەكات لە (فحشاء)و (منكر) و (بَغي) {(فحشاء)[1] هەر کردەوەیەكەو هەر قسەیەكە، کە ناشیرینییەکەی دیار بێ بۆ هەموو کەس، (منكر)یش[2] ئەوەیە کە بە عەقڵ و هۆش بزانرێ خراپ و دزێوە، (بغي)[3]یش دەست درێژییە بۆ سەر خەڵك، هەر جۆرە دەست درێژییەك بێ} خوا ئامۆژگارییتان دەكات بەڵکو بێتەوە بیرتان و پەند وەربگرن.

---

(١) الفحش والفحشاء والفاحشة: ما عظم قبحه من الأفعال والأقوال. مفردات ألفاظ القرآن، ص٣٩٠، ط/٢٠١٢م، الطبعة العصرية.

(٢) المنكر: كل فعلٍ تحكم العقول الصَّحيحة بِقُبْحِهِ. هەمان سەرچاوە، ص٥٢٤.

(٣) البغي: طلب تجاوز الإقتصاد فيما يُتَحَرّى... هەمان سەرچاوە، ص٦٧.

٦- لەبواری فیکر و ڕۆشنبیرییدا:

بەڕێزان! لەم بوارەشدا:

أ- باشترین پەسند بریتیە لە: گوێگرتن بۆ هەموو کەس، پێویستە ئینسان داخراو نەبێ و، کراوە بێ، گوێ بۆ هەموو کەس بگرێ، بزانێ چییان لەلایە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر.

واتە: موژدە بدە بەو بەندانەم، کە گوێ بۆ هەموو قسەیەك دەگرن، بەڵام شوێن باشترینی دەکەون، ئا ئەوانە کەسانێکن خوا خستوونیە سەر ڕێگای ڕاست و ڕێنمایی کردون و، ئەوانە خاوەن عەقڵانن.

ب- خراپترین ناپەسندیش بریتیە لە: وشکیی و دۆگمایی و، پێوە چەسپانی ئەو بیر و بۆچوون و فیکرە بەمیرات گیراوانەی کە لە پێشووان دابوون، ئنجا سبحان الله! ئەمە لە نێو مسوڵمانانیدا زۆر زۆرە، بەڵکو هەندێك لەوانەی کە (ئەهلی عیلم)یشن، ئەوەی کە خوا لە موشریکەکانی بە ڕەخنە گرتوە، ئەوانیش هەمان شت دووبارە دەکەنەوە، خوا عز وجل لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشووانی لە موشریکەکان بە ڕەخنە گرتوە، لە چەند شوێن لە قورئاندا خوا ئەوەی باسکردوە، بۆ وێنە:

﴿ وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزخرف.

واتە: هەر بەو شێوەیە: لە پێش تۆدا لە هیچ ئاوەدانییەکدا، هیچ وریاکەرەوەیەکمان نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەکانیان گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێبازێك دیوە، ئێمەش هەر بە شوێنی واندا دەڕۆین و لا نادەین.

لە چەند شوێنێکدا ئەوە دووبارە بۆتەوە[1]، کە ئێستا زۆربەی مسوڵمانان بە داخەوە تووشی ئەو حاڵەتی دۆگمایی و شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانیان بوون و، دەستیان گرتوە بە بیرۆکەکانیانەوە، کە زۆر جار ئەوەش بەناوی دینداریی بەخەڵك دەفرۆشنەوە، بە تایبەتی ئەوە کە دەڵێن: شوێن سەلەفی ساڵح دەکەوین! بەڵام بێگومان نابێ بە دوای بیر و بۆچوونەکانی سەلەفی ساڵح بکەوی، ئەوەی کە پەیوەست بووە بە ژینگەو ڕۆژگاری خۆیانەوە، بەڵکو دەبێ بە دوای بەرنامەکەیان بکەوی، میتۆد (منهج)ەکەیان، چۆنیان مامەڵە کردوە لەگەڵ وەحیی و واقیعدا، دەبێ بەرنامەکەی ئەوان بگریە بەر، ئەوان هەر مەسەلەیەکیان هاتۆتە پێش: تەماشای قورئانیان کردوەو، پاشان تەماشای سوننەتیان کردوە، ئنجا تەماشای واقیعی خۆیانیان کردوەو حوکمەکەیان لە قورئان و سوننەت هەڵهێنجاوە، تۆش دەبێ وەك ئەوان بکەی، نەك ئەو دەرمانانەی ئەوان گرتوویاننەوە بۆ نەخۆشییەکانی سەردەمی خۆیان، تۆش هەمان دەرمان بەکاربهێنیەوە! ئایا ئێستا هەمان چەك کە پێشینمان لە ڕۆژگاری خۆیاندا بەکاریان هێناوە بۆ جەنگ، هەمان چەك بەکار دێنی؟ یان هەمان جل و بەرگ کە لەبەریان کردوەو، هەمان کەل و پەل کە بەکاریان هێناوە، ئایا ئەو پۆشاك و کەل و پەلانە بەکار دێنی؟ نەخێر، کەواتە: دەبێ بە گوێرەی بەرنامەو بە میتۆدی ئەوان مامەڵە بکەین لەگەڵ وەحیی و واقیعدا، نەك قسەکانی ئەوان، دووبارە بکەینەوە.

---

(١) وەك: ١- (البقرة) -١٧٠-.
٢- (المائدة) -١٠٤-.
٣- (لقمان) -٢١-.

### ٧- لە بواری ڕەوشت و ئاکاردا:

أ- بە تایبەت هەڵس و کەوت لەگەڵ خەڵکدا، گەورترین پەسند (معروف) بریتیە لە: ئەمانەت پارێزیی:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

واتە: خوا فەرمانتان پێ دەکات کە سپاردەکان بە خەڵکی شایستەیان بسپێرن...

ئەمانەت پارێزیی بە مانای فراوانی ئەو وشەیە، سپاردەیەکت کە پێ دەسپێرری، دەبێ بیپارێزی و، زایەی نەکەی.

ب- گەورەترین ناپەسند (منکر)یش، بریتیە لە: خیانەت و ناپاکیی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأنفال.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ناپاکیی بەخواو پێغەمبەرەکەی مەکەن و ناپاکیی لە سپاردەکانتاندا مەکەن، لە حاڵێکدا کە دەشزانن (چەندە خراپە!).

٨- لە بواری جەنگ و جیهاددا:

أ- گەورەترین پەسند (معروف) لەم بوارەدا ئەوەیە كە شەریعەت فەرمانی كردوە بە: ئامادە كردنی هێز: ﴿وَأَعِدُّوا لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ﴿٦٠﴾﴾ الأنفال، واتە: هەرچی دەتوانن لە هێز بۆیان ئامادە بكەن..

هەروەها خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (التوبە)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَرَادُوا ٱلْخُرُوجَ لَأَعَدُّوا لَهُۥ عُدَّةً ﴿٤٦﴾﴾،

واتە: ئەگەر ویستبایان دەربچن بۆ جەنگ پێداویستیەكانیان بۆ ساز دەكردن.

بەڵێ هەر گەلێك بیەوێ جەنگ و جیهاد بكاو فیداكاریی بكا، خۆی بۆ ئامادە دەكات، بەڵام ئەگەر خۆی بۆ ئامادە نەكردو، هۆكارەكانی بۆ نەگرتنە بەر، مانای وایە بەتەمای جەنگ و بەرگریی كردن نیەو، بە تەمایە تەسلیمی ئەمری واقیع بێ، هەر چەندە ئێستا بەداخەوە داعش كارێكی كردوە كە خەڵك لەوانەیە لەزۆر كۆڕ و مەجلیسان هەر نەوێرێ باسی جەنگ و جیهاد و شەریعەت و دەوڵەتی ئیسلامیی و ...هتد بكا!، بەڵام نا، ئێمە نابێ لە هیچ واقیعێكدا، هیچ حەقیقەتێكی ئیسلام ژێر لێو بخەین، ئەوەی كە خوا فەرموویەتی و بۆی داناوین، نابێ دەستبەرداری ببین، هەر لەبەر ئەوەی خەڵكێكی دیكە بە هەڵە بەكاری هێناوەو ناشیرینی كردوە!

ب- گەورەترین ناپەسند (منكر)یش لە بواری جەنگ و جیهادا، بریتیە لە: دەست درێژیی و، بەزاندنی سنوورەكانی شەرع، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَقَٰتِلُوا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ البقرة،

واتە: لەڕێی خوادا، لە دژی ئەوانە بجەنگن، كە لە دژتان دەجەنگن، بەڵام دەستدرێژیی مەكەن، سنوور مەبەزێنن، بێگومان خوا سنوور بەزێنانی خۆش ناوێن.

# باسی سێیەم

## پێوەری لێك جیاكردنەوەی حەڵاڵ و حەرام، لە قسەو كردەوان و لە شتان

حەڵاڵ: ئەو شتەیە كە خوا ڕەوای كردوەو قەیدی ڕێگریی (منع)ی، لەسەر نیەو[1]، خوا سبحانە و تعالی هەر شتێك سوودی بۆ ئێمە هەبێ، لێی قەدەغە نەكردووین، بەڵكو وەك چۆن هەر چی بۆی حەڵاڵ كردووین، هەمووی پاكە و چاكە و سوود بەخشە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف، هەرچی سوود بەخشە و چاكە بۆیان حەڵاڵ دەكا.

(ٱلطَّيِّبَٰتِ) كۆی (طيبة)یە، یانی: شتی پاك و چاك و سوودبەخش و بەلەززەت[2].

بەهەمان شێوەش هیچ شتێكی لێ قەدەغە نەكردووین كە زیانبەخش و خراپ نەبێ، وەك فەرموویەتی: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف.

واتە: هەرچی پیس و زیانبەخشە، لێیان قەدەغە دەكات.

---

(١) بڕوانە: مفردات ألفاظ القرآن، ص ٢٥، والمعجم الوسيط، ص ١٩٣.

(٢) معجم مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص ٥٢٧، (وأصل الطيِّب ما تَسْتَلِذُّهُ الحواس وما تَسْتَلِذُّهُ النفس).

(ٱلْخَبَٰٓئِثَ ) کۆی (خبیثة)یە، واتە: زیان بەخش و پیس و بێکەڵك[1].

لە سۆنگەی ئەوەوە کە بناغە لە قسەو کردەواندا (الأقوال والأعمال) و لە شتان (الأشیاء)دا بریتیە لەڕەوایی و ڕێپێدران (الحِلِّیة) و (الإباحة) وەك زانایان، وەك بنچینەیەکی شەرعیی گوتوویانە: (الأصل في العادات الإباحة)، (الأصل في الأشیاء الإباحة)، کە دیارە ئەم بنچینەیەشیان لەو جۆرە ئایەتانە وەرگرتوە:

أ- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ أَلَمْ تَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴿٢٠﴾ ﴾ لقمان.

ج- ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثیة.

بەڵێ لە سۆنگەی بناغەو ئەسڵ بوونی ڕەوایی (إباحة) لەو دوو بوارەدا، شەریعەت تەنیا ئەو قسەو کردەوەو شتانەی کە قەدەغەن دیاریکردوون، چونکە ئەوان کەم و سنووردارن، تاکو بزانرێ کە جگە لەوانە هەموو قسەو کردەوەو شتەکانی دیکە ڕەواو ڕێپێدراون.

ئێستاش با سەرو تیشك بخەینە سەر هەر کام لە:

قسەو کردەوە قەدەغەو خراپەکان و، شتە زیانبەخشە قەدەغە کراوەکان واتە: سەرەکیی و بنەڕەتییەکانیان:

---

(١) سەرچاوەی پێشوو، ص٢٢٧، (الخُبثُ والخَبیثُ: ما یُکْرَهُ رِداءَةً وخساسةً، محسوساً کان أو معقولاً، وأصله الردیء الدُّخْلَةُ (الدخلة: البطانة الداخلة) الجاري مجری خبث الحدید).

**یەکەم: قسەو کردەوە خراپ و قەدەغەکان:**

لە بواری ئەو قسە و کردەوانەدا کە قەدەغەی کردوون، ئایەتێکی کۆکەرەوە (جامع) هەیە لە سوورەتی (الأعراف)دا، کەخوای کاربەجێ بە ئامرازی (إنَّما) دەیهێنێ:

﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ .

واتە: بڵێ: پەروەردگارم! تەنیا ئەو شتانەی قەدەغە کردوون:

١و٢- ﴿ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ﴿٣٣﴾ ﴾ گوناهە دزێو و ناقۆڵایەکان، کە هەر کەسێ بیانبینێ، دەزانێ قێزەونن و، بە ئاشکرا دیارە کە خراپن، ئنجا چ ئاشکرا بن، چ بە پەنهانیی ئەنجام بدرێن.

٣و٤- ﴿ وَالْإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ ﴿٣٣﴾ ﴾ الأعراف، گوناهو دەست درێژیی بە ناهەق، ئنجا زانایان دەڵێن: گوناهو دەست درێژیی هەر بە ناهەقن، بۆیە دەڵێن: ئەوە قەیدێکی (وصفي)یەو قەیدێك نیە، مەبەستی ئەوەبێ کە: (إثم)ی بە هەقیش هەیە، یاخود دەستدرێژیی (بغي) بەهەقیش هەیە! بەڵکو قەیدێکە وەسفی گوناح (إثم)ەکە دەکا، ئەگەرنا (إثم) هەر بەناهەقەو، دەستدرێژیی (بغي)ش هەر بە ناهەقە، (إثم) ئەو گوناهەیە کە لە بەینی خۆت و خوادا، دەیکەی، (بغي)یش ئەوەیە کە لە نێوان خۆت و خەڵکدا دەیکەی، واتە: پێشێل کردنی مافی ئەوانی دیکە.

٥- ﴿ وَأَن تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا ﴿٣٣﴾ ﴾ هەروەها خوا ئەوەی قەدەغە کردوە، هاوبەشێکی بۆ دابنێن، کە بەڵگەی لەسەر نەناردوە.

٦- ﴿ وَأَن تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾، هەروەها ئەوەشی قەدەغە کردوە، کە شتێك بڵێن بە ناوی خواوە کە نایزانن.

دووەم: شتە خراپ و قەدەغەن:

لەم بوارەشدا باسی دوو شتی سەرەکیی دەکەین:

أ- لەبواری ئافرەتاندا:

ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردوە لە ئافرەتان، کە هاوسەرگیریيان لەگەڵدا بکرێ، لەئایەتەکانی (٢٣) و (٢٤)ی سوورەتی (النساء)دا، خوای کاربەجێ باسی چواردە (١٤) جۆر ئافرەت دەکات، کە ئەوانە قەدەغەن، یانی: لێرەدا خوا بنچینەیەکی داناوە، ئەوانەی کە خراپ و قەدەغەن، ئەوانەی سەرژمێری کردوون، چونکە فەرموویەتی:

﴿وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ﴿١١٩﴾﴾ الأنعام.

واتە: (خوا) هەرچی قەدەغەیە بە درێژیی و ڕوونیی بۆی باسکردوون، مەگەر ئەوەی بۆی ناچار بن..

واتە: هەرچی کە دەمێنێتەوە غەیری ئەوانە، کە قەدەغە کراون، هەمووی پاك و حەڵاڵە، چ لەقسەو بیر و بۆچوون و کردەوان، چ لە ئافرەتان، خوا دەفەرموێ:

﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَاتُكُمْ وَعَمَّاتُكُمْ وَخَالَاتُكُمْ وَبَنَاتُ الْأَخِ وَبَنَاتُ الْأُخْتِ وَأُمَّهَاتُكُمُ اللَّاتِي أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَاتُكُم مِّنَ الرَّضَاعَةِ وَأُمَّهَاتُ نِسَائِكُمْ وَرَبَائِبُكُمُ اللَّاتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَائِكُمُ اللَّاتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَائِلُ أَبْنَائِكُمُ الَّذِينَ مِنْ أَصْلَابِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا بَيْنَ الْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾ وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ۖ كِتَابَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاءَ ذَٰلِكُمْ ... ﴿٢٤﴾﴾ النساء.

واتە: دایکانی خۆتانتان لێ قەدەغە کراون، هەروەها کچەکانتان و، خوشکەکانتان و، پوورەکانتان و[1]، پلکەکانتان و[2]، کچانی براو، کچانی خوشك و، دایکانێکتان کە شیریان پێداون و، خوشکانی شیرییتان و، دایکانی هاوسەرانتان و، کچانێکی پەروەردە کراوی باوەشتان لەو ژنانەتان کە چوونەتە لایان، بەڵام ئەگەر نەچووبنە لایان گوناهتان ناگات، هەروەها هاوسەرانی ئەو کوڕانەتان کە لە پشتی ئێوە بوون، هەروەها کە دوو خوشکان پێەکەوە کۆ بکەنەوە، مەگەر ئەوەی ڕابردوە، بە دڵنیایی خوا لێبوردەی میهرەبانە، هەروەها ژنانێکی پارێزراو (هاوسەردار) مەگەر بکەونە دەستتان (وەك کەنیزەك)، ئەوە فەرزی خوایە، ئنجا سەرجەم ئافرەتانی جگە لەوانە باسکران بۆتان ڕەوان..

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم)، پوور (عَمّة) و پلك (خالة)ی ژنیشی خستوونەتە گەڵ، وەك دەفەرموێ: {لَا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا} أخرجه مالك برقم (١١٠٨)، والبخاري برقم (٤٨٢٠)، ومسلم برقم (١٤٠٨)، والنسائي برقم (٣٢٨٨).

واتە: ڕەوا نیە ژن و پوور (عَمّة)ی، یان پلك (خالة)ی پێکەوە (لەژێر نیکاحی کەسێکدا) کۆ بکرێنەوە.

کەواتە: دەبنە شازدە (١٦)، ئەو شازدە (١٦) جۆرە ئافرەتە، لە پیاو قەدەغەن، کە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکات و، غەیری ئەو شازدە (١٦) جۆرە، هەموو ئافرەتانی دیکە ڕەوان، ئنجا لەبەر ئەوەی ئەوانەی کە ڕەوان زۆر زۆرن، بۆیە خوا ئەوانەی کە قەدەغەن، دیارییان دەکا، بۆ ئەوەی تۆ بزانی ئەوەی دیکە هەمووی ڕەوایە.

**ب- لە بواری جۆرەکانی گۆشتدا:**

گۆشتی ئاژەڵان، هەمووی ڕەوایە، جگە لە چوار جۆر کە خوای پاك و تاك لە چوار شوێناندا باسی کردوون، کە بریتین لە:

---

(١) پوور (عمة) خوشکی باب.

(٢) پلك (خالة) خوشکی دایك.

خۆم بۆ لەیەك جیاکردنەوە (پوور)م بۆ خوشکی باب و، (پلك)م بۆ خوشکی دایك بەکارهێنان.

١- گۆشتی بەراز.

٢- مردار.

٣- خوێن.

٤- بۆ غەیری خوا سەربڕاو.

هەم لە سوورەتی (البقرة) -١٧٣-دا، خوا باسی کردوون، هەم لە سوورەتی (الأنعام) -١٤٥-داو، هەم لە سوورەتی (النحل) -١١٥-داو، هەم لە سوورەتی (المائدة) -٣-شدا.

دیارە لە سوورەتی (المائدة)دا ژمارەیان بۆتە یازدە (١١) جۆر، بەڵام حەوت (٧)یان هەر دەچنەوە نێو چوارەکانی دیکەو، هەر دەبنەوە بە چوار جۆر.

شایانی باسیشە بابەتێکم لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا نووسیوە، دەربارەی ئەوە کە بۆچی خوا سبحانە و تعالی لەچوار شوێنی قورئاندا دەفەرمویٚ: بەس ئەو چوار جۆرە گۆشتە قەدەغەن، هەڵبەتە لە چوار شوێندا خوا حەقیقەتێك بفەرمویٚ، زۆر جێی سەرنجە! ئنجا دوو لە سوورەتەکان مەککەیین، سوورەتی (النحل)و سوورەتی (الأنعام)، دووشیان مەدینەیین، سوورەتی (البقرة) و (المائدة)، لە هەر کام لەو چوار سوورەتانەدا، خوا دەفەرمویٚ: بەس ئەو چوار جۆرە گۆشتە قەدەغەن، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرمویٚ:

﴿ قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ ﴿١٤٥﴾ ﴾.

واتە: بڵێ: لەوەدا کە بۆم نێردراوە، نابینم هیچ شتێك قەدەغە بێ، مەگەر مردار بێ، یان خوێنێکی ڕژاو بێ، یان گۆشتی بەراز بێ، کە بێگومان پیس و زیانبەخشە، یان لادەرانە بۆ جگە لە خوا سەربڕابێ و دەنگی لەسەر بەرز کرابێتەوە...

ئەوە لە سوورەتی (الأنعام)دایە، کە مەککەییە، بەڵام هەمان شت لە: (البقرة) و (المائدة)شدایە، کە (المائدة) کۆتا سوورەتە دابەزی بێ لە سوورەتە

مەدەنییەکان، بە تێکڕا، بۆیە ئەوە زۆر جێی سەرنجە! ئەوەشتان بۆیە پێدەڵێم، با عەقڵی خۆمان فراوان بکەین، لە کۆریا، لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، جۆرەها جانەوەر دەخۆن، مار، بۆق، مشك، قرژاڵ، هەرچی تۆ بە فکرت دادێ، لە کۆتایی ساڵی (٢٠١٠ز)دا چووم بۆ مالیزیاو کەمبۆدیا، چەندان جۆرە زیندەوەرو ژیاندار لەسەر سینی دایان نابوون، لە تەشتێکی ئاودا، دەبووایە بە دارووچکەیەکی وەك چنگاڵ لێت داباو دەرت هێنابایە، هەر بە کاڵی دەخورا!! هەروەها لە هەندێك وڵاتان گۆشتی سەگ دەخۆن!

بەڕێزان! ئیسلام وەك وەحیی و شەریعەت بە کەڵکی هەموو کات و شوێنێك دێ، بەڵام وەك فیقە، نا، زۆرجار نموونەم هێناوەتەوە بە تەیەممومم، بە پێی مەزهەبی شافیعیی ڕەحمەتی خوای لێبێ، تەیەمموم تەنیا بە: (ترابٌ طاهرٌ له غبار)، {گڵێك پاك بێ و تۆزی لێ هەڵسێ} دروستە، بەڵام:

١)- بەستەڵەکی سەرووی دنیا، بەس بەفرە، هەر چەندی هەڵیقەنی ناگاتە گڵ.

٢)- لە وڵاتی ئێمەدا بەفر دەبارێ و، دنیا هەمووی دادەپۆشێ، من سەفەرم کردوە بە نێو بەفردا، دوو سێ شەو و ڕۆژ هەر لە نێو بەفردای، گڵ لەکوێ بێنی؟!

٣)- بەهاران هەموو دنیا سەوزە.

٤)- بچۆ ئەو بیابانانە هەمووی لمە.

٥)- هەندێك شوێن هەمووی چیایە.

٦)- باران و تەرزە دەبارێ، خاك هەمووی دەبێتە قوڕ!

ئەدی چۆن بە گڵی پاکی تۆز لێ هەڵساو تەیەمموم بکەین؟

بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئایەتەکە: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴿٤٣﴾﴾ النساء.

واتە: ڕوو بکەنە ڕووی پاکی زەمین (الصعید: وجه الأرض)[١]، ڕووی زەوی، ئنجا گرنگ ئەوەیە ڕووی زەوی پاك بێ، کە پاك بوو، بۆت هەیە دەستی پێدابێنی، تەیەممومی خۆت دەکەی، بەڵام وەرە بزانم گڵی پاك (تراب طاهر)م بۆ لەکوێ دێنی؟! بۆیە ئیمە ئیجتیهاد و تێگەیشتنی زانایان (ڕەحمەتی خوایان لێبێ)، دەبێ وەك تێگەیشتنی ئەوان دەربارەی دین تەماشای بکەین، کە بێگومان (دین) لە (فیقە)داو، لە تێگەیشتنی زانایاندا، کورت هەڵنایەت، لە بواری عادەت و نەریت و هەڵس و کەوت و بەرگ و پۆشاك و خواردن و خۆراك و، ...هتددا، یانی: ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە کات و شوێن و ژینگەوە زوو گۆڕانیان بەسەردادێ.



---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٤٨٤.

# باسی چوارەم

## پێوەری لێك جیاکردنەوەو پۆلێنکردنی خەڵك، لەسەر ئاستی: تاك و کۆمەڵ و قەوارەکان

خوای پەروەردگار ناڕاستەوخۆ فەرمانی پێکردووین، کە ئێمە هەر کەسە وەك خۆی تەماشای بکەین و، وەك شایستەیەتی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین بۆ نموونە، خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

١- ﴿ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًاۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ ﴾ السجدة.

واتە: ئایا کەسێك کە بڕوادارە وەك کەسێکە کە لاڕێیە؟ یەکسان نین.

٢- ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ القلم.

واتە: ئایا گەردن کەچان وەك تاوانباران دادەنێین؟ چیتانە چۆن بڕیار دەدەن! ئایا بیر ناکەنەوەو ڕاستییەکانتان نایەنەوە بیر؟!

٣- ﴿ أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ ﴾ ص.

واتە: ئایا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکان دەکەن، وەك تێکدەران لە زەویدا دادەنێین، یان ئایا پارێزکاران، وەك گوناهکاران دادەنێین؟!

٤- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووین: {أَنزِلوا النّاسَ مَنَازِلَهم} أخرجه الخرائطي في مكارم الأخلاق (ص ٣٧، رقم ٤٦)، واتە: خەڵك لە شوێنی خۆیاندا دابنێن.

دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، (الصديقة بنت الصديق)، خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: {أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نُنَزِّلَ النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ} أخرجه أبي يعلى في مسنده ج٨/ص٢٤٦ ح٤٨٢٦.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردووین: خەڵك لە شوێنی خۆیاندا دابنێین.

کاتێکیش ئەوەی گوت، کە سواڵکەرێك بە دەرگایان داهات، لەتکە نانێکی دایە، دوایی پیاوێکی دیکەش بە دەرگایان داهات، فەرمووی لێ کرد و خواردنی بۆ دانا، گوتیان: ئەی دایکی ئیمانداران! ئەوەیان لەتکە نانێکت دایەو بەڕێت کرد، ئەوەشیان فەرمووت لێکرد و خواردنتان بۆ دانا؟! گوتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردووین هەر کەسە لەشوێنی خۆیدا دابنێین.

یانی: یەکەمیان سواڵکەر بوو، ئەو لەتکە نانە سەر و زیادی بوو و، هەر ئەوەندەی چاوەڕێ دەکرد، بەڵام ئەوەی دووەم، ئەگەر لەتکە نانێکم دابایە، پێی ئیهانە بوو، دیارە ڕێبوارێك و پیاوێکی بەڕێ و جێ بووە!!

هەر کەسە، دەبێ بەپێی خۆی، مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، مەسەلەکە ئەوە نیە کە هی یەکەمی پێ کەم بووە، بەڵام ئەو سواڵکەرە دەچێ بۆ دە (١٠) ماڵی دیکەش و، هەر یەکە و شتێکی دەداتێ، ئەو کابرایەش پێی عەیبە بەماڵاندا بگەڕێ، هاتوە بۆ ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پاروە نانێکی بدەنێ، ئەگەر نا، دەڕوا، ڕەنگە پێی عەیب بێ بچێتە ماڵێکی دیکە.

ئنجا پۆلێنکردنی خەڵکیش، دەبێ لە پێنج ڕووەوە بێ:

(١)- لەو ڕووەوە کە ئایا ئەو هێز و وزانەی خوا پێیداون، بۆ پەیپێبردنی شتەکان، بۆ زانین، لە لایان سەلامەت ماون، یان پەك خراون؟

(٢)- لەو ڕووەوە ئەوە کە ئایا ئەهلی ئیمانن، یان ئەهلی کوفرن؟!

(٣)- لەو ڕووەوە کە ئایا ئەهلی ئیستیقامەتن و بە ڕاستە ڕێدا دەڕۆن، یاخود لایان داوە؟!

(٤)- لەو ڕووەوە کە ئایا چاکە خوازن و چاکە کارن، یاخود خراپەکارن؟!

(٥)- لەو ڕووەوە کە ئایا سەرفرازن، یاخود بێ مرادو زیانبارن؟!

خوای پەروەردگار لەو ڕووانەوە خەڵك پۆلێن دەکا، با تەماشای چەند ئایەتێك بکەین، بۆ وێنە:

**١/ لە ڕووی بەکارهێنان و بەکارنەهێنانی هێزو تواناکانی زانین و پەیپێبردنەوە:**

أ- خوا باسی ئەوانە دەکا، کە عەقڵ و دڵیان بەکاردێنن، ستایشیان دەکاو دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿١٩١﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بە دڵنیایی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و جێگۆڕکە (یان جیاوازیی) شەوو ڕۆژاندا نیشانەگەل هەن بۆ خاوەن عەقڵان، ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن و، بیر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە.

لێرەدا وەك دەبینین: خوا ستایشی ئەوانە دەکا، کە عەقڵیان بەکار دێنن، دڵیان بەکاردێنن و، ئەهلی فیکر و ئەهلی زیکرن.

ب- لەو لاوەش بە پێچەوانەوە: باسی ئەوانە دەکات کە عەقڵ و دڵ و هەستەوەرەکانی خۆیانیان لەکار خستوون:

﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: بێگومان زۆرێك لە مرۆڤ و جندمان بۆ دۆزەخ داناون: دڵیان هەن پێیان تێناگەن و، چاویان هەن پێیان نابینن و، گوێیان هەن پێیان نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن بگرە گومڕاتریشن، ئەوانەن بێ ئاگایان.

لێرەشدا خوا زەمی ئەوانە دەکا، کە ئەو توانا و وزانەی خوا پێی داون، عەقڵ و، چاو و، گوێ، بەکاریان ناهێنن بۆ دۆزینەوەی حەق، ئەوانەی پێشێ بەوە

ستایشی کردن، هەم عەقڵیان بەکاردێنن بۆ فیکر، هەم دڵیان بەکاردێنن بۆ زیکر، سەرەنجامیش دەڵێن:

﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١)﴾ آل عمران.

واتە: پەروەردگارمان! ئەم (بوون)ەت بەبێ حیکمەت نەهێناوەتە دی، پاکیی و بێ خەوشیی بۆتۆ لە سزای ئاگر چەپاڵەمان بدە!

ئەوانی دیکەش سەرەنجامەکەیان ئەوەیە: کە وەك ئاژەڵن و لە ئاژەڵیش خراپترن.

**٢/ لەو ڕووی ئیمان هێنان و کافر بوونەوە:**

**أ-** خوا تبارك و تعالی لەبارەی بڕوادارانەوە فەرموویەتی:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ (١) الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ (٢) وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ (٣) وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ (٤)﴾ المؤمنون،

واتە: بەڕاستیی بڕواداران سەرفرازن، ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا (بۆ خوا) زەبوون و ملکەچن و، ئەوانەی بەلای (قسەو کرداری) پووچ داناچن و، ئەوانەی ئەنجامدەری زەکاتن.

**ب-** هەروەها لەبارەی بێبڕوایانەوە فەرموویەتی:

﴿إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا (٥٦)﴾ النساء.

واتە: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان دەخەینە نێو ئاگرێکەوە، هەر کە پێستەکانیان برژان، پێستی دیکەیان بەبەردا دەکەین، تاکو ئازار بچێژن، بە دڵنیایی خوا زاڵی کارزانە.

**٣/ لە ڕووی ڕاست وەستاویی و نەلەخشاویی و، لادان و خلیسکانەوە:**

**أ-** خوا عز وجل لەبارەی ڕاست و وەستاویی بڕوادارانەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾ الأحقاف.

واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بڵێن: پەروەردگارمان خوایە، ئنجا ڕاوەستاویش بن، هیچ ترسیان لەسەر نیەو پەژارەش داناگرن (دڵتەنگ نابن).

**ب-** هەروەها لەبارەی لادان و خلیسکانی بێ بڕوایانەوە فەرموویەتی:

﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴿١٢٤﴾ ﴾ طه.

واتە: هەر کەسێکیش پشت لە یادو بەرنامەی من بکات، بێگومان ژیان و گوزەرانێکی تەنگ و تاڵی دەبێ.

**٤/ لە ڕووی چاکەکاریی و چاکسازیی و، خراپەکاریی و تێکدانەوە:**

**أ-** خوای تواناو زانا لەبارەی چاکەکاریی چاکەکارانەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَـٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾ هود.

واتە: تەنیا چاکسازیی کردنم مەبەستەو، کارئاسانییم تەنیا بەخوا دەکرێ، پشتم هەر بەو قایمەو، تەنیا بۆ لای ویش دەگەڕێمەوە.

**ب-** هەروەها لەبارەی تێکدانی تێکدەرانەوە فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَآئِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَآءَهُمْ وَيَسْتَحْىِۦ نِسَآءَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤﴾ ﴾ القصص.

واتە: بە دڵنیایی فیرعەون خۆی لە زەویدا بەرز کردەوە، خەڵکەکەی بەش بەش کرد، کۆمەڵێکی لێ دەچەوساندنەوە: کوڕەکانیانی سەر دەبڕین و ئافرەتەکانیانی بە زیندوویی دەهێشتنەوە، بێگومان ئەو (فیرعەون) لە تێکدەران و خراپەکاران بوو.

**٥/ لە ڕووی سەرفرازیی و بەختەوەریی و، بێ مرادیی و زیانبارییەوە:**

أ- خوای بەبەزەیی لەبارەی سەرفرازی بڕوادارانەوە فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ الْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾ النور.

واتە: بێگومان قسەی بڕواداران کاتێك بانگ کران بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی کە دادوەرییان لە بەیندا بکەن، تەنیا ئەوەیە کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین و هەر ئەوانەش سەرفرازو بەختەوەرن.

ب- لەبارەی زیانبارانی بێ مرادیشەوە فەرموویەتی:

﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾﴾ الكهف.

واتە: بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم لە بارەی کەسانێکەوە کە زیانبارترینن لە کارو کردەوەکانیاندا؟ ئەوانەن کە کۆششیان لە ژیانی دنیادا زایە بووە (تەنیا سەرگەرمی ژیانی دنیان) و، پێشان وایە کاری چاکە دەکەن! ئەوانە کەسانێکن بڕوایان بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان و دیداری نیە، سەرەنجام کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە، بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا هیچ سەنگ و حورمەتیان بۆ دانانێین.

بەڵێ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، لەم پێنج ڕووانەوە خەڵك پۆلێن دەکرێن، واتە: لەو ڕووانەوە پۆلێن ناکرێن، کە: کێ دەوڵەمەندە و کێ هەژارە؟

یان کێ ڕەشە و کێ سپییە؟

یان: تەنانەت کێ خوێندەوارەو کێ نەخوێندەوارە؟

یان کێ نێرە و، کێ مێیە؟

بەڵکو لەو پێنج ڕووەوە کە باسمان کردن، لەو پێنج ڕووەوە ئیسلام فەرمان بە مسوڵمانان دەکات، خەڵك پۆلێن بکەن و، هەر کامێکیان وەك خۆی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و لە پێگەی پڕ بە پێست و شایستەی خۆیدا دابنرێ.

لێرەشدا کۆتایی بەم تەوەری چوارەمەی بابەتی فراوانی {بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیع دا} دێنین و ستایشی شایستەی خوای میهرەبان و بەخشەر دەکەین و دەڵێین:

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

١١ ربيع الثاني ١٤٤٠ك

١٨ / کانوونی یەکەم / ٢٠١٨ز

# بەرهەمەکانی دانەر

## أ - کتێبە کوردییەکان :

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| قورئان و سوننەت | | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ١٠ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٤ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | | |
| ١٥ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٦ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٧ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ١٨ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعییانەو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ١٩ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (ڕاستییەکانی ئیسلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسانەکانی ڕێچکان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢٠ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢١ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢٢ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٣ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٤ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٥ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| ٢٦ | ڕێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |
| ٢٧ | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |
| ٢٨ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی) و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٢٩ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٠ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣١ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٢ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | | |
| ٣٣ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٤ | كتێبی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٥ | كتێبی سێیەم: تەوژمە فیكرییە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| | **فیقهی ئیسلامیی** | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٣٦ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٣٧ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٣٨ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
| ٣٩ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| ٤٠ | بنچینە گرنگەكانی هەڵسەكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٤١ | جەژن و یادو بۆنەكان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤٢ | چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| ٤٣ | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزكیەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار** | | |
| ٤٤ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٥ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠ چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش |
| ٤٦ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٤٧ | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانە وتعالى)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٤٨ | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| ٤٩ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٠ | گیانی ژیان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥١ | مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگەوازو کاری ئیسلامیی** | | |
| ٥٢ | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٣ | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨ چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٤ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٥ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٥٦ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٥٧ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٥٨ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٥٩ | ئیسلام و كێشە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٠ | زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦١ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٢ | چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا بكەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٣ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٤ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٥ | بۆئەوەی لەسەر جیهادكردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٦ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٦٧ | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٨ | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و كاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٦٩ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٧٠ | بەشدارییكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەكەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز كراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەكەم: بەڵگەكانی ئەوانەی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەكانی ڕەوایی بەشداریكردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧١ | هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتارە پەڕگیرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٢ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٣ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| ٧٤ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٥ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٧٦ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | | |
| ٧٧ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٧٨ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٧٩ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ٨٠ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٨١ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨٢ | سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٣ | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | سیاسەت و حوکمڕانیی | | |
| ٨٤ | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٨٥ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٨٦ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٨٧ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |
| ٨٨ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٨٩ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ٩٠ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩١ | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٢ | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مێژوو** | | |
| ٩٣ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ٩٤ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٩٥ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ٩٦ | سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ٩٧ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ٩٨ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ٩٩ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٠٠ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠١ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٢ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنكەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٣ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونكردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٤ | چەند بنەمایەكی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٥ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٦ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەكی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٧ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە كێ دەكرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕاوە |
| ١٠٨ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بكەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٠٩ | واقیعی هەرێمی كوردستان، دیدێكی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٠ | سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە |
| ١١١ | كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٢ | حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١١٣ | مەلای گەورەی كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٤ | لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١٥ | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١١٦ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٧ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١١٨ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١١٩ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| | **ب- کتێبە عەرەبییەکان** | | |
| ١٢٠ | موسوعة : الإسلام كما يتجلى في كتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: |
| ١٢١ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٢ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٣ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٤ | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٥ | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٦ | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٧ | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٢٨ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٢٩ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣٠ | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | | |
| ١٣١ | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | | |
| ١٣٢ | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٣٣ | نقض فكرة التطرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٤ | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٥ | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٦ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٣٧ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٣٨ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٣٩ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٤٠ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٤١ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٢ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٣ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٤ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٥ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٦ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| | **ئەو كتێبانەی لەژێر چاپن** | | |
| ١٤٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | |
| ١٤٨ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | | |
| ١٤٩ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | | |
| ١٥٠ | سیاسەتکردنی رەوشت بەرزانە: چۆن و بۆچی؟ | | |

نێوەڕۆك

## کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
## مامۆستا عەلی باپیر



• ناو: عـەلی بـاپیر وەتمـان، لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١) لەقەزای پشدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیە و سلێمانیی) و لای زانایانی کوردستانی عێراق و کوردستانی ئێران بەدەستهێناوە.

• لەساڵی (١٩٨١) لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتووەو ئاوارەی ئێران بووە.

• لەساڵی (١٩٨٣) گەڕاوەتەوە کوردستانی عێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو بەردەوام بووە لەسەر دەرس وتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و...هتد.

• لەساڵی (١٩٨٧ز) دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنی، چۆتە چیا و دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامیی دا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

• لە ساڵی (١٩٨٨)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• لەساڵی (١٩٩١)دا ڕۆڵی گەورەی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١) داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• تا ساڵی (٢٠٠١) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ چەند هێزو مەڵبەندێکی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا ماوەتەوە، هەر لەزینداندا کتێبی: (الإسلام يتجلى في كتاب الله)ی نووسیوەو، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨)دا لەزیندان ڕزگاری بووە.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) کتێب و نامیلکەی نووسیوە لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس...).

• ئێستا پڕۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو نیوەی زیاتری تەواوکردوە.

• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥) داو، لەهەموویاندا، ناوبراو بەئەمیری حزب هەڵبژێردراوە.

• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر کە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

**بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:**

www.alibapir.net

/alibapir /alibapir1 /MediaAmeerOffice

# پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی

پرۆسـەی کارلێـك (تفاعـل)ی عەقـڵ و هۆشـی مسـوڵمانان لەگـەڵ وەحیـی خـوای پـەروەردگار و، واقیعێکـدا کـە تێیـدا دەژیـن، ئـەو کارلێکـە، هەمیشـە هـۆکاری گەشـە کـردن و بـەرەو پێـش چوونیـان و، بەزیندوویێتـی مانـەوەی کۆمەڵگاکانیـان بـووە، بـە پێچەوانەشـەوە: لێـك دابڕانـی عەقـڵ و هۆشـی مسـوڵمانان لـە تێوەڕامانـی وەحیـی و، چـاك تێگەیشـتنی واقیـع، هەمیشـە هـۆی مردوویێتیـی و وەسـتان و بـەرەودوا چوونەوەیان بووە، وەك ئێستا دەیبینین.

بەڵـێ ئـەم حاڵەتـەی ئێسـتا مسـوڵمانانی تێـدان، حاڵەتێکـە کـە مسـوڵمانان- بەشـێوەیەکی گشـتی- بـاش نەیانتانیـوە کـە عەقڵ و هۆشـی خۆیانـی تێـدا بخەنـەکار بـۆ تێوەڕامانی وەحیی و، سەرنجدانی واقیع...

هیواداریشـم ئـەم مەوسـووعەیە بەهـەر پێنـچ تەوەرەکەیـەوە، هـەوڵ و هەنگاوێکـی کاریگەربـێ، بـۆ گێڕانـەوەی مسـوڵمانان بـەرەو ئـەو حاڵەتـە پەسـندە سروشـتییەی، کـە نەقڵ و عەقـڵ لێیـان دەخـوازن، بەڵکـو لـەدەردی وەسـتان و بـە جێماویی دەربازیان بێ.

**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٦٠مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice